ژان پۆل سارتەر

# مێشەکان

درامایەکە لە سێ پەردەدا

وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا



**پێشکەشە بە Charles Dulin**

**وەک گەواهییەک بۆ پێزانین و دۆستایەتی**

-سارتەر-

ناوی کتێب: مێشەکان - درامایەکە لە سێ پەردەدا
شانۆگەری - نووسینی: ژان پۆل سارتەر
وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: نەجاتی عەبدوڵڵا
ناوونیشانی دەقە فەرەنسییەکەی: **Jean-paul Sarter., les mouches**
**Drame en trois actes, éditions Gallimard, Paris, 1999.**
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٧٦
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: محەمەد زادە
پیت لێدان: نادیە عەزیز
هەڵەگری: لوتفی عەبدولفەتاح - شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمان مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٢
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٤٤)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ

## کەسەکان

ژووپیتێر
ئۆرست
ئێگست
پەروەردەکار
یەکەم پاسەوان
دووەم پاسەوان
کەشیشی مەزن
ئێلکتر
کلیتیمنستر
ئێرینی
ژنێکی گەنج
پیرەژنێک
پیاوان و ژنانی گەل
ئێرینییەکان، خزمەتکارەکان
پاسەوانانی کۆشک

گۆڕەپانێک لە ئارگۆس. پەیکەرێکی ژووپیتێر، خوداوەندی مێش و مەرگ. دوو چاوی سپی، دەموچاوێکی لە خوێن هەڵکێشراو.



## شانۆی یەکەم

*چەند پیرەژنێکی ڕەشپۆش دێنە ناو تەوافەکە و لەبەردەم پەیکەرەکە مەی دەڕێژن. گێلێک لەوپەڕەوە لەسەر زەوی دانیشتووە. ئۆرست و پەروەردەکار دێن، پاشانیش ژووپیتێر دێت.*

ئۆرست: هێی ژنە باشەکان!

(هەموو بەهاوارێکەوە ئاوڕ دەدەنەوە).

پەروەردەکار: دەتوانن پێمان بڵێن...

(پیرەژنەکان هەنگاوێک بۆ دواوە دەنێن و تف دەکەنە سەر زەوی).

پەروەردەکار: گوێ بگرن، ئێوە پیرەژنەکان، ئێمە گەشتیاری ڕێگە لێ ونبووین. تەنها یەک ڕێنوێنییم لە ئێوە دەوێ.

(پیرەژنەکان بەڕاکردنەوە گۆزەکانیان لێ بەردەبێتەوە).

پەروەردەکار: پیرە بەدەکان! تۆ بڵێی پێیان وا نەبێ من جوانیەکانیانم دەوێ؟

ئاه! خودایەکەم، چ گەشتێکی خۆش بوو! ئێوە چاکتان کرد کە هاتن بۆ ئێرە لەکاتێکدا چ لە یۆنانستان، هەروەک لە ئیتاڵیا زێتر لە پێنج سەد پایتەخت هەیە لەگەڵ باشترین مەی، هۆتێلی بەپێشوازی و شەقامی پڕ لە خەڵک. ئەو خەڵکە چیانشینانە وا پێدەچێ هەرگیز ئۆرستیان نەبینیبێ؛ سەد جاران لەم شارۆچکە نەفرەتییە خۆر بردووە داوای ڕێگەم کردووە. لە هەموو شوێنێکەوە هەمان هاوارە تۆقێنەرەکان، هەمان پەرتەوازەیی، ڕاکردنە قورسە ڕەشەکان لە شەقامە گومڕاکەرەکان! ئۆف! ئەم شەقامە بیابانە، هەوایەکەی کە دەلەرزێ و، ئەم خۆرە... چی هەیە لە خۆر شوومتر؟

ئۆرست: من لێرە لەدایک بووم.

پەروەردەکار: وا پێدەچێ. بەڵام ئەگەر من لە شوێنی ئێوە بم، خۆمی پێوە

هەڵنانێم.

ئۆرست: من لێرە لە دایک بووم و دەبێ وەکو ڕێبوارێک پرسیار لە ڕێگەم بکەم.

– لەم دەرگایە بدە!

پەروەردەکار: هیوا بەچی دەخوازیت، وەڵامی چیت دەدەنەوە؟

کەمێک بروانە ئەم ماڵانە باسی سیمایانم بۆ بکە. پەنجەرەکانیان لەکوێن؟

وا خەیاڵ دەکەم پەنجەرەکانیان بەتەواوی بەسەر دادگایەکی تەواو تاریکدا دەکرێنەوە و دواوەشیان بەلای شەقامدا سووڕاندووە، (هێمایەکی ئۆرست). ئەمە چاکە. لە دەرگا دەدەم. دەرگاکە تۆزێک کرایەوە.

دەنگێک: چیتان دەوێ.

پەروەردەکار: تەنها یەک ڕێنوێنی. دەزانی لەکوێ دەژی...

(دەرگاکە لە ناکاوێکەوە پێوە دەدرێتەوە).

پەروەردەکار: بڕۆ خۆت بخنکێنە! ئایا ئێوە دڵشادن ئۆرستی بەڕێز، ئایا ئەزموون بەشتان دەکات؟ من دەتوانم ئەگەر ئێوە بتانەوێ لە هەموو دەرگاکان بدەم.

ئۆرست: نا لێگەڕێ.

پەروەردەکار: چاو، بەڵام یەکێک وا لێرەیە (لە گێلەکە نیزیک دەکەوێتەوە).

– گەورەمان!

گێلەکە: ها!

پەروەردەکار: دەفەرموویت ماڵی ئێگستمان نیشان بدەی؟

گێلەکە: ها!

پەروەردەکار: ئێگست، پاشای ئارگۆس.

گێلەکە: ها! ها!



(ژووپیتێر لەو پەڕەوە تێدەپەڕێ).

پەروەردەکار: بێ شانسی! یەکەمین کەس ڕا ناکات، گێلە.

(ژووپیتێر جارێکی دیکە تێپەڕ دەبێ) بەنموونە! ئەو تا ئێرە شوێنمان کەوت.

ئۆرست: کێ؟

پەروەردەکار: ڕیشووەکە.

ئۆرست: تۆ خەون دەبینی.

پەروەردەکار: تازە بەر لەئێستە بینیم بێرەدا ڕەتبوو.

ئۆرست: تۆ خۆت بەهەڵەدا دەبەیت.

پەروەردەکار: ناشێ. لە ژیانمدا ڕیشووی وام نەدیوە، ئەگەر یەکێکی لێوە دەربهاوێژم، ئەو برۆنزییەی کە ڕوخساری ژووپیتێری ئاهینۆ ریشوو لە پالارم **Palarme** دا دەرازێنێتەوە، چاو ئا ئەوەتا جارێکی دیکە تێپەڕ دەبێ، چی لە ئێمە دەوێ؟

ئۆرست: ئەویش وەکو ئێمە سەفەر دەکات.

پەروەردەکار: سەیرە! ئێمە لەسەر ڕێگەی دۆلف تووشی بووین، وەختایەکیش لە ئاتیناوە لە پاپۆڕەکە دابەزین، ئەو پێشتر زوو ریشی وەسەر پاپۆڕەکەوە نابوو. لە ناپۆلی نەماندەتوانی هەنگاوێک هەڵبگرین بێ ئەوەی لەبەردەست و پێماندا نەبێت، ئا ئەوەتانێ لێرەیە. بێگومان ئەمە بۆ تۆ تەنها ڕێکەوتێکی سادەیە؟ (بەدەستەکانی مێشەکان پاس دەکات). ئای ئەوە خۆ مێشەکانی ئارگۆس لە خەڵکەکانی زێتر پێشوازیان لێکردم. بنوارە ئەمانە، بەڵام لێیان بنوارە!(هێما بۆ چاوەکانی گێلەکە دەکات). دوانزەیەک دەبن لەسەر چاوەکانی، وەک ئەوەی لەسەر نان و کەرەی مرەباوی بن.

ئەویش لەگەڵ ئەوەشدا بۆ فریشتەکان پێدەکەنێ، وا دەردەکەوێ حەز بەوە بکات چاوەکان شیر بدەن. جا بەڕاستی لەو برژانگانەوە

ئاوگێکی سپی لێوه دەردەچێ کە هەر لە ماستی مەییو دەچێ
(مێشەکان پاس دەکات). ئەمە چاکە، هۆ مێشەکان، چاکە، چاو،
ئا ئەوەتانێ لەسەر ئێوەن (مێشەکان پاس دەکات). ئێ چاکە ئەوە
کەیفسازتان دەکات، ئێوە کە ئەوەندە گلەیی دەکەن لەوەی لە ولاتی
خۆتان بێگانەبن؛ ئەم ئاژەڵۆکانە ئاهەنگتان بۆ ساز دەکەن، ئەوان وا
پێدەچێ بتانناسن (مێشەکان پاس دەکات).

بفەرموون، ئاشتی! ئاشتی! بێ خوێنرشتن! لە کوێوە دێن؟ ئەوان
زێتر دەنگە دەنگ دەکەن وەک لە زەنگۆڵە دارینەکان و لە کوللەکان
گەورەترن.

(ژووپیتێر کە خۆی نزیک کردبووبۆوە)

ئەوانە تەنها مێش گۆشتن کەمێک قەڵەون. ئەوە پانزە ساڵ دەبێ
بۆنی بەهێزی کەلاکێک ڕایکێشاونەتە نێو شار، لەو ساکاوە ئەوانە
قەڵەو دەبن. پانزە ساڵی دیکە بەقەد بۆقی چکۆڵەیان لێدێت.

(بێدەنگی)

پەروەردەکار: بەدیمانەی کێ دەگەین؟

ژووپیتێر: ناوم دێمێتریۆسە لە ئاتیناوە هاتووم.

ئۆرست: لەو باوەڕەدام، لەم پانزە ڕۆژەی دوایی ئێوەم لەسەر پاپۆڕەکە
بینی.

ژووپیتێر: منیش هەروا ئێوەم بینی.

(هاوارێکی تۆقێنەر لە کۆشکەوە).

پەروەردەکار: مەخابن، مەخابن! هەموو ئەمانە بۆ من هیچ ناگەیەنن و من
خاوەنی ڕای خۆمم؛ گەورەم، شایەد کارێکی چاک بکەین ئێرە
جێبهێڵین.

ئۆرست: بێدەنگ بە.

ژووپیتێر: پێویست بە ترس ناکات. ئەمڕۆ جەژنی مردووانە. ئەم هاوارانە



نیشانەی دەستپێکی ئاهەنگەکەیە.

ئۆرست: وا پێدەچێ ئێوە چاک شارەزای ئارگۆس بن.

ژووپیتێر: من زۆر جار سەری ئارگۆس دەدەم. دەزانی من لێرە بووم لە
کاتی گەڕانەوەی شا ئاگامەمنوون، وەختایەک کەشتیگەلی
سەرکەوتووی گریکەکان لە بەندەری ناپۆلییەوە لەنگەری گرت.
دەمانتوانی چارۆکە سپییەکان لە بەرزایی شوورەکانەوە ببینین
(مێشەکان پاس دەکات). ئەودەم هێشتا مێشی لێ نەبوو؛ ئارگۆس
تەنها شارێکی چکۆڵەی هەرێمەکە بوو کە لەبەر خۆر بێباکانە
وەڕس بووبوو. لە ڕۆژانی دواتر من لەگەڵ ئەوانی تردا وەسەر
ڕێگەی شوورەکان کەوتین، ماوەیەکی زۆر ڕوانیومانەتە ڕێوڕەسمی
پادشایی کە بە پێدەشتەکەدا ڕەت دەبوو. لە ئێوارەی دووەمین ڕۆژدا
شاژن کلیتیمنستر بە یاوەری ئێگست، پاشای ئێستە لەسەر
شوورەکانەوە وەدیارکەوت، خەڵکی ئارگۆس سیمایان بەتاوی
خۆرئاوابوون سوور هەڵدەگەڕا، بۆی دەچەمانەوە و بە بەرزایی
سەنگەرەکانەوە بۆ ماوەیەکی درێژ دەیاننۆڕیە دەریا، پێیان وابوو:
«بەڵایەکی تێدا ڕوودەدات»، بەڵام هیچیان نەگوت. ئێوە دەبێ
بزانن کە ئێگست، گراوی شاژن کلیتیمنستر بوو. پیاوێکی
سەرسەری کە لەو سەردەمەدا، پێشتر مەیلی مالنخۆیی هەبوو. وا
دیارە ئێوە ماندوون؟

ئۆرست: ئەوە ڕێپێوانێکی درێژ بوو کە کردم و، هەروا ئەم گەرما
نەفرەتییە، بەڵام ئێوە سەرنجم ڕادەکێشن.

ژووپیتێر: ئاگامەمنوون پیاوێکی چاک بوو، بەڵام هەڵەیەکی گەورەی کرد،
هەروەک دەبینن مەخابن ڕێگەی بەوە نەدا. کە لە سێدارەدانەکان
بەئاشکرا بن. لە سێدارەدانێکی چاک، ئەمە لە هەرێمەکان بێ
سەرنج ڕاکێشان دەکرێ. ئەمەش کەمێک خەڵک لە مەرگ قێزەون
دەکات. خەڵکانی ئێرە هیچیان نەوت. چونکە ئەوان لەخۆیان بێزار

بوون و دەیانویست مەرگێکی کوشندە ببینن. ئەوان هیچێکیان نەوت، وەختایەک بینیان پاشاکەیان لەبەر دەروازەی شارەکە وەدیار دەکەوێ. وەختایەکیش کلیتیمنستر باڵە جوانە گوڵاوییەکانی ڕادەکێشی هیچێکیان نەوت. لەو کاتەدا لەوانەبوو وشەیەک، تاقە وشەیەک بەس بوایە، بەڵام بێدەنگ بوون، هەر یەکێکیشیان لەوان لەنێو مێشکی خۆیەوە دیمەنی مەیتێکی گەورەی دەموچاو تێکشکاوی هەبوو.

ئۆرست: ئەی ئێوە هیچتان نەوت؟

ژووپیتێر: کوڕی گەنج، ئەمە تووڕەت دەکات؟ من زۆر کەیفسازم، ئەوە بەڵگەیەکە بۆ هەستە چاکەکانت. جا بزانە، نەء من قسەم نەکرد: من خەڵکی ئێرە نیم، ئەمانەش کاری من نەبوون. هەرچی خەڵکی ئارگۆسە، بۆ ڕۆژی دوایی، وەختایەک بیستیان کە پاشاکەیان لەتاو ئازار لەنێو کۆشکەوە دەناڵێنێ، دیسان هیچیان نەوت، پێڵووەکانیان بەسەر ئەو چاوانەدا شۆڕکردەوە کە بەسەر هەوەسدا وەریانگێڕابوو و شار سەرتاپای وەک ئافرەتێکی لە هەوەسدا بووبوو.

ئۆرست: ئاوا بکوژ حوکمڕانی دەکات. پانزە ساڵ خۆشبەختی بەخۆیەوە بینی. من باوەڕم وا بوو خوداوەندەکان دادپەروەرن.

ژووپیتێر: مەخابن! ئەوەندە بەپەلە خوداوەندەکان تاوانبار مەکە. جا دەبێ هەمیشە سزا هەبێ؟ ئایا ئەوە چاکتر نییە ئەم هەرا و زەنایە بە قازانجی سیستمی مۆراڵەوە وەرچەرخێنین.

ئۆرست: ئەوە، ئەوەیە کە خوداوەندەکان کردیان؟

ژووپیتێر: ئەوان مێشەکانیان نارد.

پەروەردەکار: مێشەکان لەوێ لەو ناوەوە چی دەکەن؟

ژووپیتێر: ئۆه! ئەمە ڕەمزێکە بەڵام ئەوەی ئەوان کردیان خۆت حوکمی لەسەر بدە: ئەم پیرە قالۆنچە لەوێ دەبینی کە بە پێیە چکۆڵە



ڕەشەکانییەوە باز هەڵدەدات و بەدیوارەکانەوە هەڵدەگەڕێ، ئەمە نموونەیەکی جوانە لەم ئاژەڵە ڕەش و پانانەی کە ئاپۆرەی شەقاری دیوارەکان دەدەن. تاو دەدەمە سەر ئەم گەزەندەیە و دەیگرم و بۆتی دەهێنم.

(هەڵدەکوتێتە سەر پیرەژن و دەیهێنێتە بەر دەم پەردەکە). ئەمەیە ڕاوی من.

سەیری ئەم تۆقینەم بۆ بکە، چاوەکانت دادەخەی، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ و ئەوانی دیش، بەشمشێرە سوورە بەرەو سپی هەڵگەڕاوەکانی خۆر ڕاهاتوون. بڕوانە ئەم هەڵبەزینانەی ماسییەکان لە کۆتایی دەزووییەکەوە. پێم بڵێ پیرەژن دەبێ تۆ دوانزە کوڕت ون کردبێ: تۆ کە لە سەرەتاوە تا پێیەکانت ڕەشە، بدوێ و لەوانەیە ئازادت بکەم. لەبەر چی بەرگی ماتەمیت پۆشیوە؟

پیرەژن: ئەمە جلوبەرگی خەڵکی ئارگۆسە.

ژووپیتێر: جلوبەرگی خەڵکی ئارگۆس؟ ئاها! تێگەیشتم. ئەمە ماتەمینی پاشایەکەتە کە تۆ ڕەشپۆشی، هی پاشا کوژراوەکەت.

پیرەژن: بێدەنگ بە! لەڕێگەی خودا، بێدەنگ بە.

ژووپیتێر: چونکە تۆ زۆر پیری، تۆ ئەم هاوارە گەورانە کە سپێدەیەک لە شەقامەکانی شارەکەدا هەڵسان گوێت لێبوو، تۆ چیت کرد؟

پیرەژنەکە: پیاوەکەم لە کێڵگە بوو، چیم پێدەکرا؟ دەرگاکەم کلۆم دا.

ژووپیتێر: بەڵێ تۆ پەنجەرەکەت کەمێک کردەوە تا چاک گوێت لێ بێ، خۆت لەپشت پەردەکانتەوە شاردەوە، هەناسەبڕاو، هاوڕێ لەگەڵ خۆشنوودییەکی ختووکە ئامێز لە قووڵایی گورچیلەکانەوە.

پیرەژن: بێدەنگ بە!

ژووپیتێر: دەبێ تۆ ئەو شەوە زۆر بەچاکی گانت کردبێ و ئەمە جەژنێک بوو، وا نییە؟

پیرەژن: ئاها! جەناب، ئەمەیان... جەژنێکی ترسناک بوو.

ژووپیتێر: جەژنێکی سوور کە ناتوانن بیرەوەرییەکەی بنێژن.

پیرەژن: گەورەم ئایا ئێوە مردوو بوون؟

ژووپیتێر: مردوویەک! وای، لاچۆ لا، شێتە! خۆت بەوە خەریک مەکە کە من کێم، چاکتر وایە خەریکی خۆت بی و بە پەشیمان بوونەوەت ئاسمان لێت ببووریێ.

پیرەژن: ئاهـ! من پەشیمانم، گەورەم، ئەگەر دەزانی چەندە پەشیمانم، هەروا کچەکەشم پەشیمانە، زاواکەم هەموو ساڵێک چێڵێک دەکاتە قوربانی و کورەزایەکەشم کە بەرەو حەوت ساڵی دەچێ، لەناو پەشیمانبوونەوەدا گەورەمان کردووە: ئەو ئاقڵە وەک وێنەیەک وایە تەواو بەڵەک، پێشتر هەستی هەڵە ڕەسەنەکانی خۆی بەناودا ڕۆچووە.

ژووپیتێر: ئەمە چاکە، ونبە، پیرەی پیس، هەوڵبدە لەناو پەشیمانبوونەوە پڕ ببە، ئەمە تاقە شانسی تۆیە بۆ ڕزگاربوون. (پیرەژن ڕادەکات). گەورەکانم یا ئەوەتا من تەواو هەڵەم، یا ئەوەتا ئەمە ئایینپەروەرێکی چاکە لەسەر ڕێچکەی پێشینان و، پشت ئەستوورە بە تیرۆر.

ئۆرست: تۆ چ پیاوێکی؟

ژووپیتێر: کێ خەمی من دەخوا؟ ئێمە لەبارەی خوداوەندەکانەوە دواین. چاکە پێویستی دەکرد ئێگست لەناو ببرێ؟

ئۆرست: پێویست بوو... ئاهـ! من نازانم دەبوایە چی بکرێ و بەخۆم پێدەکەنم، من خەڵکی ئێرە نیم. ئایا ئێگست خۆی پەشیمانە؟

ژووپیتێر: ئێگست؟ زۆر سەراسیمەم دەکات. بەڵام گرینگی چییە؟ شارێک بۆ ئەو پەشیمانە. پەشیمانی ئەمە قورساییەکی هەیە، (چەند هاوارێکی تۆقێنەر لە کۆشکەوە)، گوێبگرە! تا هەرگیز هاوارەکانی سەرەمەرگی پاشاکەیان لە یاد نەچێ، گاوانێکیان هەڵبژارد تاکو لەهەر بیرەوەریەکدا بە دەنگی بەهێزیەوە لە هۆڵی



گەورەی کۆشکەوە بنەڕێنێ.

(ئۆرست هێمایەکی بێزهێنانەوە دەکات). پەح، ئەمە هیچ نییە ئێوە چی دەڵێن کە تاوێکی دیکە واز لە مردووەکان بێنن. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەوە پانزە ساڵە کە ئاگامەمنوون کوژراوە. ئاهـ! چەند گۆڕاوە لەو ساوە، گەلی سووکی ئارگۆس، ئێی ئێستە چەند لە دڵمەوە نزیکە!

ئۆرست: لە دڵی تۆوە؟

ژووپیتێر: لێگەڕێ، لێگەڕێ، کوڕی گەنج. من لەگەڵ خۆم قسە دەکەم. دەبوایە بڵێم: نیزیک لە دڵی خوداوەندەکانەوە.

ئۆرست: بەڕاستی؟ دیواری لە خوێن هەڵکێشراو، ملیۆنەها مێش، بۆنی گۆشتفرۆش، گەرمایی مرۆکوژ، شەقامە چۆڵەکان. خوداوەندێک بەسیمای کوژراوەوە. کرمە توقێنراوەکان کە لە ناو ماڵەکانیانەوە سینەی خۆیان دەکوتا- و ئەم هاوارانە، ئەم هاوارانە کە بەرگەی ناگیرێ: ئایا ئەمەیە کە بەدڵی ژووپیتێرە؟

ژووپیتێر: حوکم بەسەر خوداوەندەکان مەدە کوڕی گەنج، ئەوان نهێنی ئازاراویان هەیە.

(بێدەنگی)

ئۆرست: پێم وابێ ئاگامەمنوون تەنها کچێکی هەبوو؟ کچێک بەنێوی ئێلکتر؟

ژووپیتێر: بەڵێ، لێرە دەژی. لە کۆشکی ئێگست، ئەوەیان کە دەیبینی.

ئۆرست: ئاهـ! ئەوە کۆشکی ئێگستە؟ ئەی ئێلکتر چۆن بیر لەم هەمووە دەکاتەوە.

ژووپیتێر: پەح ئەوە کچێکی منداڵە. ئاگامەمنوون هەروەها کوڕێکیشی هەبوو، بێگومان، ئۆرست ناوێک بوو دەڵێن مرد.

ئۆرست: مرد! بێگومان......

پەروەردەکار: بێگومان بەڵێ، گەورەم، ئێوە چاک دەزانن کە ئەو مرد.

خەڵکی ناپۆلی بۆیان گێڕاینەوە کە ئێگست فەرمانی داوە تاوێک دوای مەرگی ئاگامەمنوون بیکوژن.

ژووپیتێر: هێندێک هەبوون پێیان وابوو کە زیندووە. ڕاسپاردەکارەکانی بۆ کوشتن بەزەیییان پێداهاتۆتەوە لە دارستان جێیانهێشتووە. دەوڵەمەندە بۆرژواییـیەکانی ئاتینا هەڵیانگرتۆتەوە و بەخێویان کردووە. بۆمن، ئارەزوو دەکەم کە مردبێ.

ئۆرست: بۆچی، تکایە؟

ژووپیتێر: خەیاڵ بکە ڕۆژێک لەبەر دەروازەی ئەم شارەوە بوەستێ...

ئۆرست: ئێ جا ئەوە......؟

ژووپیتێر: پەح، بنۆڕە، ئەگەر چاوم پێکەوت، پێی دەڵێم... ئەمەی پێ دەڵێم بە «کوڕی گەنج......» ناوی دەبەم: کوڕی گەنج، چونکە نیزیکی تەمەنی تۆیە ئەگەر لە ژیاندا بێ. بەم بۆنەیەوە گەورەم ناوی خۆتمان پێ دەڵێی؟

ئۆرست: من ناوم فیلیبە و خەڵکی کۆرتینیام. سەفەر دەکەم بۆ فێربوون لەگەڵ کۆیلەیەک کە پەروەردەکارم بوو.

ژووپیتێر: زۆر چاکە. کەوا بوو دەڵێم: «کوڕی گەنج لێرە بڕۆ! لێرە بەدوای چیدا دەگەڕێی؟ دەتەوێ مافەکانی خۆت وەگیر بخەیتەوە؟ ئاھ! ئێوە چالاک و بەهێزن، دەبنە کاپیتانێکی چاک لە سوپایەکی جەنگاوەر، ئەوە بۆ تۆ چاکترە لەوەی حوکمگێڕی شارێک بی کە نیوەی مردوو بن. بینارێژی شارێک کە مێشەکان هەڵیدەپاچن. خەڵکی ئەم شارە گوناهباری گەورەن، بەڵام ئەوەتا ڕێگەی تۆبەیان گرتووە. کوڕی گەنج لێیان گەڕێ، لێیان گەڕێ، ڕێز لە پرۆژە ئازاراوییەکانیان بگرە، بەبێدەنگی دووربکەوە تۆ ناتوانی بەشداری پەشیمانیان بکەیت، چونکە تۆ دەستت لە تاوانەکانیاندا نەبووە. پاکییە بێ گوناهەکەت وەک چاڵێکی قووڵ لەوانت جیادەکاتەوە، ئەگەر کەمێک خۆشیانت دەوێن کۆچ بکە، کۆچ بکە چونکە بزریان



دەکەیت: ئەگەر بۆ تۆزێکیش لە ڕێگەدا بیانوەستێنی و ڕێگەیان بگۆڕی، ئاخۆ دەبێ ئەمە ساتێک لە پەشیمانییان بێت. هەموو هەڵەکانیان وەک چەورایییەک کە سارد دەبێتەوە بەسەر گیانیانەوە دەبیەستێ. ئەوان ویژدانێکی خراپەکاریان هەیە.- ئەوان دەترسێن- و ترس و ویژدانی خراپەکارییان بۆنێکی خۆشیان بۆ لووتی خوداوەندکان هەیە. بەڵێ ئەم گیانە بەسەزمانانە بەدڵی خوداوەندەکانن، دەتانەوێ بەخششی خوداییـیان لێ ببڕن؟ لە جێی ئەوە چییان دەدەیتێ؟ هەرەسکردن بەکاوەخۆ، ئاشتی، خەمۆکی هەرێمەکان و بێزاری، ئاھ! بێزاری چەند خۆشبەختییەکی ڕۆژانەیە. سەفەرێکی خۆش، کوڕی گەنج، سەفەرێکی خۆش، سیستمی شار و سیستمی ڕۆحەکان جێگر نین: ئەگەر دەستیان لێبدەی ئەوە کارەساتێک دەنێیتەوە (دەنوارێتە ناو چاوەکانی) کارەساتێکی تۆقێنەر کە بەسەر خۆتدا دەشکێتەوە.

ئۆرست: بەڕاستی؟ ئەمانەت پێدەگوت؟ ئای ئەگەر من ئەو کوڕە گەنجە دەبووم، وەڵامم دەدایتەوە... (هاوسەنگ دەبن لە ڕوانین، پەروەردەکار دەکۆکێ)! پەح! نازانم چیت وەڵام بدەمەوە. لەوانەیە ئێوە ڕاستبن، پاشان ئەمە هیچ پێوەندییەکی بەمنەوە نییە.

ژووپیتێر: سوپاس بۆ خودا. خوازیارم کە ئۆرست ئەوەندە ئاقڵ بووایە. بفەرموون، دروودتان لێ بێ، دەبێ من بۆ لای کارەکانم بڕۆم.

ئۆرست: دروود لە ئێوەش.

ژووپیتێر: بەم بۆنەیەوە ئەگەر ئەم مێشانە بێزارت دەکەن ئەمە ڕێگەیە بۆ خۆپاسکردن، بنۆڕە ئەم گرۆ مێشەنگوینانەی بەدەوری ئێوەوە دەخولێنەوە. لەپڕ ڕادەوەشێنم قۆڵم ڕادەتەکێنم، دەڵێم:

«ئەبراکساس گالە، گالە، تسێ، تسێ»: سەیریان کە، ئەوەتا دەکەونە خوارەوە و وەک کرمەپەپوولە بەسەر زەویدا دەخشێن.

ئۆرست: لە چاوی ژووپیتێر!

ژووپیتێر: ئەمە هیچ نییە. ئەوە بازیچەیەکی کات بەسەربردنە. من یاریچی مێشانم لە کاتەکانی بێکاریدا. ڕۆژباش. دەتبینمەوە.

(دەردەچێ)

## شانۆی دووەم

ئۆرست، پەروەردەکار

پەروەردەکار: ئاگاداربە. ئەم پیاوەیان دەزانێ تۆ کێیی.

ئۆرست: جا ئەوە پیاوە؟

پەروەردەکار: ئاه! گەورەم، چەند ئازارم دەدەیت! کەوایە چیت لە وانەکانی من و ئەو گومانە پێکەنیناوییانە کرد کە پێم وتی؟ «جا ئەوە پیاوە؟». بێگومان تەنها هەر پیاو هەن. جارێ بەسیەتی. ئەم پیاوە ڕیشووە، یەکێکە لە سیخوڕەکانی ئێگست.

ئۆرست: واز لە فەلسەفەکردن بهێنە. فەلسەفەکەت زۆر ئازاری دام.

پەروەردەکار: ئازار! جا تۆ بلێیی ئازاری ڕۆحدان بەخەڵک ئازار بێ؟

ئاه! چەند گۆڕاون! جاران من لە ئێوەدا دەمخوێندەوە... دواجار پێم نالێیی لە چی ورد دەبیتەوە؟ بۆچی بەکێشی ئێرەت کردم؟ دەتەوێ لێرە چی بکەیت؟

ئۆرست: من بە تۆم وتووە کە شتێک هەیە لێرەدا بیکەم؟ ئادەی! بێدەنگ بە (خۆی لە کۆشک نزیک دەکاتەوە). ئەوە کۆشکەکەمە. ئەوە لێرەدابوو کە باوکم لەدایک بوو. لێرەدا بوو کە سۆزانییەک و دەلالەکەی کوشتیان. منیش هەروەها لێرەدا لەدایکبووم. سێ ساڵە بووم وەختایەک جەنگاوەرەکانی ئێگست منیان برد. بێگومان ئێمە لەم دەرگایەوە دەرچووین، یەکێک لەوان منی گرتە باوەش خۆی، دووچاوی گەورەی کراوەم هەبوو و بێگومان هەر دەگریام، ئاه! بیرەوەری زێترم وەبیرنایە. تاخێکی گەورەی کەڕ دەبینم، شکۆمەندی هەرێمەکانی بەخۆوەگرتووە. بۆ یەکەم جارە دەیبینم.



پەروەردەکار: ئەی ئەمەت وەبیرنایە جەنابی گاور، کاتێک دە ساڵ لە ژیانم بۆ ئەوە تەرخانکرد بیرەوەریتان پێبدەم؟ ئەی ئەو هەموو گەشتانەی کە کردمان؟ ئەی ئەو شارانەی سەفەرمان تێدا کردن؟ ئەی ئەو وانە ئارکیولۆژییانەی کە من تەنها بە تۆم دەوتەوە؟ هیچت وەبیرنایەتەوە؟

پێشتر ئەو هێندە کۆشک، مەزارگە و پەرستگە لە ئاوەدانی بیرەوەریتدا هەبوون دەتتوانی وەکو جوگرافیناس پۆزانیاس یەک ڕێنوێنینامەی یۆنانستان بنووسیتەوە.

ئۆرست: کۆشکەکان! ئەوە ڕاستە. کۆشکەکان، دارتێلەکان و پەیکەرەکان! بۆچی من لەوە قورستر نیم، ئەوە منم ئەو هێندە بەردەم لەناو سەرە؟ ئەی سێ سەد و هەشتا و حەوت پەیژەکانی پەرستگەی ئێفیس، تۆ بۆمی باس ناکەیت؟ یەک بەیەک بەسەریان کەوتووم و، هەموویانم لەبیرە. حەڤدەهەمین پێم وایە شکابوو. ئاه! سەگێک، پیرە سەگێک کە خۆی گەرم دەکردەوە نیزیک لە ئاگردانەکە وەرکەوتبوو و لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی خاوەنەکەی کەمێک هەڵدەسایەوە، بەکاوەخۆ ناڵە ناڵی دەکرد؟ بۆ سڵاو لێکردن، سەگێک کە زیرەکتر بوو لە من: خاوەنەکەی خۆی دەناسیەوە، خاوەنەکەی. ئەی من کێ؟

پەروەردەکار: چی لە کولتوور دەکەی جەناب؟ کولتووری خۆت با بۆخۆت بێ.

من بەخۆشەویستییەوە دامهێناون وەکو چەپکە گوڵێک، لە بەری حیکمەت و خەزێنەی تاقیکردنەوەکانم دەرمهێناون. من نەبووم لە زوویێکەوە، وام لێکردی هەموو کتێبەکان بخوێنیتەوە، بۆ ئەوەی ڕابێی لەگەڵ هەمەچەشنەیی بیروباوەڕە مرۆڤایەتییەکان و، سووڕانەوە بە سەد دەوڵەت بۆ ئەوەی لەهەر ڕەوشێکدا ئەوەت بۆ دەربکەوێ کە ڕەوشتی ئینسانەکان شتێکی جوانی هەمە چەشنەن؟ ئا ئەوەتا ئێستە ئێوە گەنجن، دەوڵەمەند و بەقەد پیرەمێردێک

دونیادیتەن، ئازاد لە هەموو کۆیلەیی بوون و هەموو باوەڕێک. بێ خێزان، بێ نیشتمان، بێ ئایین، بێ پیشە، ئازاد بۆ هەموو ئیلتزاماتێک و دەشزانن کە دەبێ هەرگیز مولتەزیم نەبن. دواجار پیاوێکی باڵادەست، زێدە لەوەش شایەن بۆ وتنەوەی فەلسەفە یان ئارشتێکتۆر لە شارێکی گەورەی زانکۆییدا، ئەوجا هێشتا ئێوە سکاڵا دەکەن!

ئۆرست: نەخێر نا، من سکاڵا ناکەم. من ناتوانم سکاڵا بکەم: تۆ ئازادییەکی وەکو ئەو داوانەت بۆ هێشتوومەتەوە کە (با) لە تەونی جاڵجاڵۆکەکانەوە (دە) پێ بەسەر زەوی سەر دەکەوێ. من چیتر لەیەک لەو داوانە قورستر نیم و لە هەوادا دەژیم. دەزانم ئەمە شانسێکە و ڕێزی دەگرم؛ وەک ئەوەی شایستە بێ (تاوێک) خەڵکانێک هەن بە مولتەزیمی لەدایک دەبن. ئەوان ویستیان نییە و لەسەر ڕێگەیەکدا فڕێیانداوە، لە کۆتایی ڕێگەکەدا کردەیەک چاوەڕوانیان دەکات، کردەکانیان. ئەوان دەڕۆن و پێیە خواسەکانیان بە توندی بەسەر زەویدا دەخشێن و پێستەکانیان لەسەر بەردەکان دادەماڵرێ. ئەوە بۆ تۆ، بۆ تۆ لەزەتی چوون بۆ شوێنێک بێ مانایە؟ خەڵکی دیکە هەن، بێدەنگ، لە قووڵایی دڵیانەوە هەست بەقورسایی وێنەی پەشۆکاو و زەوی دەکەن، ژیانیان گۆڕاوە چونکە، ڕۆژێکیان لە منداڵیانەوە بەپێنج ساڵان، بەحەوت ساڵان..... ئەمە چاکە: ئەوان خەڵکی باڵا نین. من پێشتر، من لە حەوت ساڵانەوە دەزانم کە من ڕەدوونراوم، بۆنەکان و دەنگەکان، دەنگە دەنگی باران بەسەر بانەکان، هەژانەوەی ڕووناکییەکە، لێدەگەڕام بخرێنە ناو سەرتاپای لەشمەوە، بکەونە دەوروبەرم، من دەمزانی کە ئەوانە هی خەڵکی دیکەن و من هەرگیز ناتوانم بیانکەم بە بیرەوەرییەکانی خۆم. چونکە بیرەوەرییەکان ژەمی چەورن بۆ ئەوانەی ماڵ و ئاژەڵ و خزمەتکار و کێڵگەیان هەیە. بەڵام من...



من ئازادم، خودایە سوپاس.

ئاه! چەند ئازادم. ئای کە چەند نایابە ونبوونی ڕۆحم (خۆی لە کۆشک نیزیک دەکاتەوە). من لێرەدا دەژیام. من هیچێک لە کتێبەکانی تۆم نەخوێندۆتەوە و لەوانەیە من نەمزانیبێ بخوێنمەوە: بەدەگمەن هەڵدەکەوێ شایەک بزانێ بخوێنێتەوە. بەڵام لەم دەرگایەوە، دە هەزار جار چووم و هاتووم. بە منداڵی وازیم لەگەڵ دەروازەکانی کردووە و پێیەکانم لە بەرامبەریان سەقامگیر دەکرد، جیرەیان لێوە دەهات بێ ئەوەی ببەزن و دەستەکانم بەرگەیان دەگرت. دواتر شەوان، بەنهێنییەوە، پاڵم پێوە دەنان بۆ ئەوەی بچمە ژوانی کچان. ئێ هێشتا دواتر، لە ڕۆژی پێگەیشتنم، کۆیلەکان دەرگەیان بۆ دەخستمە سەر پشت و، بەسەر پشتی ئەسپەوە لە ئاستانەی ماڵ دەردەچووم. دەرگا کۆنە دارینەکەم، من بەچاوی داخراوەوە، کلیلەکانتم دەدۆزییەوە. ئێ ئەم دارووشانە لەوێ، لەخوارەوە، لەوانەیە من بەهەڵە لە یەکەمین ڕۆژ کە ڕمێکیان (خۆی دوور دەخاتەوە) لە ستیلی دۆریەنی بچووک دامێ وام لێکردبێ، وانییە؟ ئەی چی دەڵێی بۆ ئەو زێڕ و زەبەرانە؟ هەمان ئەوانەم لە دۆدۆن بینی: ئەمە جوان کراوە. بفەرموو، دڵت خۆش دەکەم: ئەمە کۆشکی من نییە، دەرگای منیش نییە و ئێمە هیچ کارێکمان لێرەوە نییە.

پەروەردەکار: ئا ئەوەتا ئێوە ئاقڵمەند بوون. چیتان قازانج کرد کە لێرە ژیان؟ گیانی ئێوە لەو ڕۆژەوە بە پەشیمانییەکی نامەرد کوژراوە.

ئۆرست، بەقاقاوە، هەر هیچ نەبێ دەبێتە هی من و ئەم گەرماییە کە قژەکانم دەسووتێنێ، ئەویش دەبێتە هی من. گزە گزەی ئەم مێشانە دەبنە هی من. لەم کاتەدا، بەڕووتی لەناو ژوورێکی تاریکی کۆشک، لە بەری پەنجەرەکەوە سەیری ڕەنگی سووری ڕووناکی دەکەم. چاوەڕوان دەکەم تا خۆر ئاوابێ و وەک بۆنی سێبەری فێنکی

ئێوارەیەکی ئارگۆس، کە بە سەدان هەزار ئێوارەی تر و هەمیشە نوێ دەچێ، سێبەری ئێوارەیەکی من. بفەرموون وەرن پەروەردەکار، ئاخۆ تۆ لەوە ناگەی کە ئێمە خەریکین لە گەرمایی خەڵکی دیکە بۆگەن ببین.

پەروەردەکار: ئاها! گەورەم خۆزیا منتان ئارخەیان بکردایە، لەم چەند مانگەی دێت تاکو دوودڵ نەبم. لەو ساوەی لەدایکبوونی تۆم ئاشکرا کرد دەتبینم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەگۆڕێن، من ئیتر ناخەوم، من دەترسێم......

ئۆرست: چی؟

پەروەردەکار: بەڵام توورە دەبن.

ئۆرست: نەخێر، قسە بکە.

پەروەردەکار: من دەترسام- چاک بوو لەکاتی خۆیدا ڕاکێشراینە ناو گاڵتەجاڕییەکی گوماناوییەوە هێندێک جار بیری دەبەنگانەت هەر بۆ دێ- بەکورتی، دەمویست بزانم ئاخۆ ئێوە بیرتان نەکردۆتەوە هەیدێ لە ئێگست بکەن شوێنی ئەو بگرنەوە.

ئۆرست، بەهێمنی.

هەیدێ کردن لە ئێگست؟ (ساتێک) تۆ دەتوانی دڵنیابی، پیاوی چاک، ئێستاکە زۆر درەنگە. لەبەرئەوە نییە کە ئارەزووم کەمە تاکو ڕیشی ئەم گەوادە نەفرەتلێکراوە بگرم لەسەر کورسی حوکمڕانی باوکمی وەلا ببەم. بەڵام دوای ئەوە؟ چی لەگەڵ ئەم خەڵکانە بکەم. لەدایکبوونی یەک تاقە منداڵ لە منداڵەکانیانم نەبینیوە، نە بەشداری ئاهەنگی کوڕەکانیشیان بووم، من لەگەڵ پەشیمانییەکانیان نیم و ناوی یەکێکیشیان نازانم. ئەو ڕیشووە لەسەر هەقە! پاشا دەبێ هەمان بیرەوەری بندەستەکانی خۆی هەبێ. لێیان گەڕێ، پیاوی چاک. بفەرموون وەرن، بەبێ دەنگی ئاها! ئەگەر کردەیەک دەبوو، دەبینی کردەیەک کە مافی شاریم دەداتێ



لەناویاندا، ئەگەر بتوانم بەرێگەی تاوانێکیش بێ، بیرەوەرییەکانیان، تیرۆریان و هیوایەکانیان داگیر بکەم بۆ ئەوەی بۆشایی دڵەکەم پڕ بکەمەوە، ئەگەرچی ناچار بم تا دایکی خۆشم بکوژم......

پەروەردەکا: گەورەم!

ئۆرست: بەڵێ، ئەوانە خەونن. بنۆڕە ئەگەر بتوانین ئەسپان بەردەست بخەین، بڕۆین تا ئەسپارتە، لەوێ من هاوڕێم هەنە.

هاتنە ژوورەوەی ئێلکتر.

## شانۆی سێیەم

هەمان کەسەکان، ئێلکتر

(ئێلکتر، قاسەیەکی هەڵگرتووە بێ ئەوەی ئەوانی دیکە ببینێ لە پەیکەرەکەی ژووپیتێر نزیک دەکەوێتەوە).

پیس و چەپەڵ! دەتوانی تەماشام بکەیت، وەرە بە چاوە خڕەکانی نێو دەموچاوی هەڵکێشراو بەخۆشاوی تووتڕکت، تۆ نامترسێنی. قسە بکە. ئایا ژنە پیرۆزەکان ئەم بەیانییە هاتن، پیرەژنە ئاخرشەڕەکان بەرۆبی ڕەشەوە. ئەوان بە پێڵاوە گەورەکانیان بەدەوروبەری تۆدا شەقە شەقیان دەکرد. تۆ دڵشاد بووی، چما وا نییە، دێو و درنج تۆ پیرەکانت خۆشدەوێن هەرچەندەش کە لە مردووەکان بچن تۆ زێتر خۆشتدەوێن. ئەوان بەناوبانگترین شەرابەکانیان لەژێر پێیەکانتدا ڕێژت، چونکە جەژنی تۆ بوو، بۆنی گەنیو لە تەنوورەکانیانەوە تا لووتت بەرز دەبۆوە. کونە لووتت هێشتا ختووکەی بەو بۆنە خۆشە دێ (خۆی پێوە دەنووسێنێ) ئەوجا بۆنم بکە، ئێستاکە بۆنم بکە، بۆنی گۆشتی تازەیە. من گەنجم، من زیندووم، ئەمە لەوانەیە تۆ بتۆقێنێ. منیش هەروا هەر ئێستاکە هاتوومەتەوە قوربانییەکانم پێشکەشت بکەم لە کاتێکدا تەواوی

شـار لەناو نوێژدایە. بگرە: ئەمـەیان توێکڵـەکـان و هەمـوو خۆڵەمێشی ئاگردان و پاشەڕۆکی گۆشتی کۆن بووی پڕ کرم و یەک پارچە نانی پیس بوو کە بەرازەکانمان پێی ڕازی نەبوو. ئەوان حەز لەوە دەکەن، لە مێشەکانت. جەژنێکی خۆش، دەی جەژنێکی خۆش، هیوادارین دوایین جەژن بێت. من هێندە بەهێز نیم و ناتوانم تۆ لە زەوی بدەم، بەڵام دەتوانم تفت لێبکەم. من هەر ئەمەندەم پێدەکرێ. بەڵام ئەو دێت، ئەوەی کە من چاوەڕوانی دەکەم، بە شمشێرە گەورەکەیەوە. ئەو بە شۆخییەوە تەماشات دەکات، ئاوەها دەستەکانی لەسەر کەمەر و بۆ پشتەوەی دەبا. پاشانیش شمشێرەکەی هەڵدەکێشێ و لە سەرەوە بۆ خوارەوە لەتت دەکات، ئاوەهابەشێکی بۆ چەپ. ئەوی دیکەی بۆ ڕاست، هەموو خەڵک دەبینێ کە ئەوە لە داری سپییە. لە داری تەواو سپی، خودای مردووەکان. تۆقین و خوێن بەسەر دەموچاو و سەوزی تاری چاوەکان ئەوە تەنها ڕووپۆشێکە، وا نییە؟

خۆت دەزانی کە تۆ لەناوەوەدا سپیت، سپی وەک لەشی تازە لەدایکبوو، تۆ دەزانی وەشاندنی یەک شمشێر شەقت دەکات بێ ئەوەی خوێنیشت لێ بتکێ. لە داری سپی! لە داری چاکی سپی: ئەمە چاک دەسووتێ (ئێلکتر ئۆرست دەبینێ) ئاها!

ئۆرست: مەترسە.

ئێلکتر: من ناترسێم. لە هیچ ناترسێم. تۆ کێی؟

ئۆرست: بێگانەیەک.

ئێلکتر: بەخێربێی. هەموو ئەوانەی بێگانەن لەم شارە خۆشەویستی منن، ناوت چییە؟

ئۆرست: ناوم فیلیبە و لە کۆرینتاوە هاتووم.

ئێلکتر: (بە پەروەردەکار) لێمان گەڕێ.

پەروەردەکار دەردەچێ.



## شانۆی چوارەم

ئۆرست، ئێلکتر

ئێلکتر: بۆچی ئاوەها تەماشام دەکەیت؟

ئۆرست: تۆ جوانی. تۆ لە خەڵکی ئێرە ناچی.

ئێلکتر: جوان؟ تۆ دڵنیای کە من جوانم؟ هێندە جوان وەک کچەکانی کۆرینتا؟

ئۆرست: بەڵێ.

ئێلکتر: لێرە خەڵکی وام پێناڵێن. نایانەوێ من بیزانم. بەهەر حاڵ ئەمە چ سوودێکی هەیە بۆ من، کە من تەنها خزمەتکارێکم.

ئۆرست: تۆ؟ خزمەتکاری؟

ئێلکتر: دوایین خزمەتکار. جلوبەرگی پاشا و پاشاژن دەشۆم. ئەوانە جلوبەرگی فرە چڵکن پڕ لە پیسین. هەموو جلەکانی ژێرەوەیان، ئەو کراسانەی کە جەستەی گەنیویان دادەپۆشێ، ئەوانەی کە کلیتیمنستر لەبەریاندەکات وەختایەک پاشا سواری دەبێت. دەبێ من هەموو ئەمانە بشۆم. چاوەکانم دادەخەم و بەهەموو هێزێکمەوە دایاندەشۆرم. من هەروا قاپ و قاچاخەکانیش دەشۆم. تۆ باوەڕم پێ ناکەی؟ چاو بدە دەستەکانم. چما شەقارەکان و چاڵاییەکان نابینی؟ چ غەریب چاوان دەگێڕی. ئایا دەبێ ئەوانە بەرێکەوت دەستەکانی شاژنێک بن؟

ئۆرست: ئەو دەستە هەژارانە. نەخێر ئەوانە وا دیار نادەن کە دەستەکانی شاژن بن. بەڵام بەردەوام بە چیترت لێدەکەن لەوە زێتر؟

ئێلکتر: دوای ئەوە، هەموو سپێدەیەک، دەبێ سەندوقی پیسایی بەتاڵ بکەمەوە. ڕایاندەکێشمە دەرەوەی کۆشک و پاشان ... تۆ بینیوتە کە چی لەو پیساییانە دەکەم. ئەم پیاوە چاکە دارینە، ئەم ژووپیتێرە،

خودای مەرگ و مێشەکان.

ئەو ڕۆژەی کە کەشیشی مەزن هاتووە تا وێردەکانی لەبەر دەمدا بکات، بەسەر ناوکی کەرنەبیت و شێلم و هێلکە شەیتانۆکەدا ڕۆیشتووە. ئەو پێی وابوو لەهۆش چووە. قسە بکە تۆ من ڕیسوا دەکەیت؟

ئۆرست: نەخێر.

ئێلکتر: دەتوانی ڕیسوام بکەیت ئەگەر بتەوێت، من دەربەست نیم.

لەوە زیاتر دەبێ چیترم لێبکەن ، لێم دەدەن؟ ئەوان پێشتر لێیان داوم. لەناو بورجێکی گەورە لەسەری سەرەوە دەمبەستنەوە؟

ئەوە هەر بیرێکی بۆگەنە و هیچی تر، من چیتر دەموچاوەکانیان نابینمەوە. خەیاڵ بکە، هەموو ئێوارەیەک وەختایەک کارەکەم تەواو دەکەم، ئەوان پاداشتم ئاوەها دەدەنەوە: دەبێ من لەیەکێک لە ژنە قەڵەو و گەورەکان کە قژیان بۆیە کردووە خۆم نزیک بکەمەوە. دوو لچی گەورە و دەستەکانی زۆر سپی، دەستەکانی شاژن کە بۆنی هەنگوینیان لێدێت. دەستەکانی دەخاتە سەر شانەکانم، لێوەکانی دەخاتە سەر نێوچەوانم و دەڵێ «ئێوارە باش ئێلکتر». هەموو ئێوارەیەک. هەموو ئێوارەیەک من هەست بەو گۆشتە گەرم و تێر نەخۆرە دەکەم لەسەر پێستەکەم. بەڵام من خۆم بەرگە دەگرم، من هەرگیز نەکەوتووم. ئەوە دایکمە تێگەیشتی. ئەگەر لە قوللە بوومایە، ئەو چیتر ماچی نەدەکردم.

ئۆرست: تۆ هیچ بیری ئەوەت بۆ نەهاتووە ڕابکەی بۆ خۆت؟

ئێلکتر: ئەم چەشنە ئازاییەم نەبووە، تەنیا لەسەر ڕێگەکان دەترسێم.

ئۆرست: تۆ هیچ کچە هاوڕێیەکت نییە کە بتوانێ لەگەڵت بێ؟

ئێلکتر: نەخێر، من تەنها خۆمم. کە من گەڕ بم، ڕەشەتا بم: خەڵکی ئەمانەت پێدەڵێن. من هاوڕێم نییە.

ئۆرست: چی هەتاوەکو دایەنێکیش ناناسی، پیرەژنێک کە تۆی بینیبێ



لەکاتی لەدایکبوونا و کەمێک تۆی خۆشبوێ.

ئێلکتر: هەتا ئەوەش نا. داوا لە دایکم بکە. من تا ناسکترین دڵیش سارد دەکەمەوە.

ئاه! هەموو ژیانم، نا! نەخێر، گوێبگرە، چاوەڕوانی شتێکم.

ئۆرست: شتێک یا کەسێک؟

ئێلکتر: پێت ناڵێم. چاکترە قسە بکەی. تۆ جوانی، هەروەها تۆش ماوەیەکی زۆر دەمێنیتەوە؟

ئۆرست: دەبێ هەر ئەمڕۆ بڕۆم و پاشان ئێستاکە......

ئێلکتر: ئێستاکەش......؟

ئۆرست: هیچی تر نازانم.

ئێلکتر: ئایا. کۆرینتا شارێکی جوانە؟

ئۆرست: زۆر جوان.

ئێلکتر: تۆ زۆرت خۆشدەوێ؟ تۆ شانازی پێوە دەکەیت؟

ئۆرست: بەڵێ.

ئێلکتر: بۆ من وا دەردەکەوێ سەیر بێ، بەوەی شانازی بەزێدی لەدایکبوونمەوە بکەم. بۆم ڕوون بکەوە...

ئۆرست: ئێ... نازانم. ناتوانم بۆتی ڕوون بکەمەوە.

ئێلکتر: تۆ ناتوانی؟ (ساتێک) ئەوە ڕاستە کە لە کۆرینتا گۆڕەپانی تاریک هەیە؟ گۆڕەپانەکان کە ئێواران پیاسەی تێدا دەکەن.

ئۆرست: ڕاستە.

ئێلکتر: ئەی هەموو خەڵک لە دەرەوەن؟ هەموو خەڵک بۆ خۆیان پیاسە دەکەن؟

ئۆرست: هەموو خەڵک.

ئێلکتر: کوڕەکان لەگەڵ کچەکان؟

ئۆرست: کوڕەکان لەگەڵ کچەکان.

ئێلکترا: ئایا هەموو کات شتێکیان هەر پێیە بۆ گوتن؟ ئایا ئەوان زۆر کەیفسازن لەگەڵ یەکتر؟ شەوان درەنگانێک گوێیان لێدەبێ پێکەوە پێبکەنن؟

ئۆرست: بەڵێ.

ئێلکترا: پێت وانییە من گەلۆرم؟ چونکە من هێندە پێم سەختە خەیاڵی پیاسەکان، گۆرانییەکان، زەردەخەنەکان بکەم. خەڵکی لێرە ترس قرپان دەکات و منیش...

ئۆرست: تۆش؟

ئێلکترا: قێن. ئەی تەواوی ڕۆژ کچە گەنجەکانی کۆرینتا چ دەکەن؟

ئۆرست: خۆیان دەرازێننەوە و پاشان گۆرانی دەچڕن، یا وەکو عود دەژەنن و پاشان سەری هاورێکانیان دەدەن، بۆ ئێوارەش دەچن بۆ سەما.

ئێلکترا: ئەی هیچ خەمی دیکەیان.

ئۆرست: پەرێشانییەکانیان زۆر کەمە.

ئێلکترا: ئاه! گوێم لێبگرە: خەڵکی کۆرینتا ئایا پەشیمانیان هەیە؟

ئۆرست: برێک جار. نەک هەموو دەم.

ئێلکترا: کەوا بوو ئەوان ئەوە دەکەن کە حەزیان لێیەتی و دواتر چیتر بیری لێ ناکەنەوە؟

ئۆرست: دەق وایە.

ئێلکترا: ئەمە سەیرە (تاوێک) شتێکی دیکە. ئەی هێشتا شتێکی دیکەم پێ بڵێ، چونکە پێویستە بیزانم لەبەر یەکێک... لەبەر یەکێک کە چاوەڕوانی دەکەم: وا دابنێ کە کوڕێک لە کۆرینتاوە، یەکێک لەو کوڕانەی کە ئێواران لەگەڵ کچان پێدەکەنن، لە گەڕانەوەی سەفەرێکدا بینی باوکی کوژراوە، دایکیشی لەناو نوێنی بکوژەکەیە و خوشکیشی کۆیلەیە، ئایا ئەم کورنیتسیە بەهێمنی دەکشێتەوە، بەرێزەوە دەچەمێتەوە بەدوای خۆشنوودییەکانی خۆی دەگەڕێ لای



هاورێیەکانی؟ یا وەکو شمشێرەکەی هەڵدەکێشێ و هەڵدەکوتێتە سەر بکوژەکە تاوەکو سەری دەپەرێنێ؟ تۆ وەڵام نادەیتەوە؟

ئۆرست: نازانم.

ئێلکترا: چۆن؟ تۆ نازانی؟

(دەنگی کلیتیمنستر)

ئێلکترا!

ئێلکترا: بێدەنگ بە!

ئۆرست: چییە؟

ئێلکترا: ئەوە دایکمە، کلیتیمنستری شاژن.

## شانۆی پێنجەم

ئۆرست، ئێلکترا، کلیتمینستر

ئێلکترا: ئێ ئەوجا چیتە فیلیب؟ کەوابێ دەتترسێنێ؟

ئۆرست: ئەم سەرە، سەد جار هەوڵمداوە بیهێنمە بەرچاو و دواجار لە کۆتاییدا بینیم، بێزار و خاو لە ژێر بریسکەی هاڕاوەی بۆیەکان. بەڵام من چاوەڕوانی ئەم چاوە مردووانەم نەدەکرد.

کلیتیمنستر: ئێلکترا، پاشا فەرمانت پێدەدا کە خۆت بۆ ڕێوڕەسمەکە ئامادە بکەیت. تۆ کەوا ڕەشەکەت و زێڕ و خشڵەکانت لەبەر بکە. چیتە؟ ئەم چاوە شۆڕانە چی دەگەیەنێ؟ ئانیشکەکانت بە کەمەرە باریکەلەکانتەوە بەستۆتەوە، جەستەت پەشۆکاوت دەکات... تۆ زۆربەی جار ئاوەها لەبەر دەمم ئامادەی، بەڵام من چیتر لێناگەڕێم ئەم گاڵتەجاڕیانە بکەیت: تاوێک بەر لە ئێستە لە پەنجەرەکەوە، ئێلکترێکی دیکەم بینی، هێمای فرە، بەچاوی پڕ لە ئاگرەوە. تۆ ڕووبەڕوو سەیرم دەکەی؟ دواجار وەڵامم نادەیتەوە؟

ئێلکترا: ئایا ئێوە پێویستتان بە خزمەتکارێکی پیس هەیە بۆ ڕازاندنەوەی

ڕەونەقی جەژنەکەتان؟

کلیتیمنستر: بەبێ گاڵتەجاڕی. ئێلکتر تۆ شاژنی و وەکو هەموو ساڵێک خەڵک چاوەڕوانت دەکەن.

ئێلکتر: بەڕاستی من شاژنم؟ ئێوە ساڵێ جارێک وەبیرتان دێتەوە، وەختایەک گەل داوای تابلۆی ژیانی خێزانمان دەکات بۆ پێشڕەوایەتی کردنەکەی؟ شاژنێکی جوان، کە قاپ و قاچاغ دەشوات و پاسەوانی بەرازان دەکات! ئایا ئێگست شانەکانم دەخاتە ناو باوەشی، وەک ساڵی پار بەڕووم پێدەکەنێ و وشەی گەف و گوڕ دەچرپێنێتە ناو گوێچکەم.

کلیتیمنستر: ئەوە دەوەستێتە سەر تۆ بۆ ئەوەی شێوەیەکی دیکە وەربگری.

ئێلکتر: بەڵێ لێبگەڕێم پەشیمانییەکانتان بگرمەوە و، ئەگەر داوێنگیری پەشیمانی خودایەکان بم لە تاوانێک کە من تێیدا بەشدار نیم. بەڵێ، ئەگەر دەستەکانی ئێگست ماچ بکەم و بە باوکی خۆم بانگی بکەم. ئۆف ئەو ژێر نینۆکانەی خوێنی وشکەوەبووی لێیە.

کلیتیمنستر: چیت دەوێ بیکە. ئەوە عەیامێکە من دەستم لەوە هەڵگرتووە بەناوی خۆمەوە فەرمانت پێبدەم. من فەرمانەکانی پاشات بۆ دەگوێزمەوە.

ئێلکتر: من چ کارم بە فەرمانەکانی ئێگستەوەیە! دایکەکەم ئەو مێردی ئێوەیە، مێردی زۆر خۆشەویست و، مێردی من نییە.

کلیتیمنستر: من هیچێکم نییە بە تۆی بڵێم، ئێلکتر. دەبینم تۆ کاردەکەی بۆ زیانی خۆت و ئێمە. بەڵام تۆ چۆن ئامۆژگاری من دەکەی، منێک کە لە تاکە یەک سپێدەدا ژیانم وێران بوو! تۆ ڕقت لێم دەبێتەوە، منداڵەکەم، بەڵام ئەوەی زێتر من نیگەران دەکات ئەوەیە، کە تۆ لە من دەگەی: ئەم سیما تیژەم هەیە، ئەم خوێنە سەراسیمەیە، ئەم چاوە مەراییکەرانە – هیچێکی چاکی لێوە شین نەبوو.

ئێلکتر: من نامەوێ لە ئێوە بچم! بڵێ فیلیب، تۆ کە ئێمە هەردووکمانت



بینیوە لە نزیکەوە، ئایا ڕاست نییە کە من لەو ناچم؟

ئۆرست: چی بڵێم؟ سیمای ئەو وەکو کێڵگەیەکە هەورەتریشقە و تەرزە وێرانی کردبێ. بەڵام سیمای تۆ وەکو وادەی باو و بۆران وایە: ڕۆژێک ئازار تا سەر ئێسک دەیسووتێنێ.

ئێلکتر: وەکو وادەی باو و بۆران؟ باوابێ ئەم وێکچوونەیانم قەبووڵە چونکە تۆ ڕاستی دەڵێی.

کلیتیمنستر: ئەی تۆ؟ تۆ کە سیمای خەڵک دادەڕووشێنی، کەوایە تۆ کێی؟ لێم گەڕێ با منیش تەماشات بکەم، ئەی تۆ چی دەکەی لێرە؟

ئێلکتر: بەگەرمییەوە.

ئەوە کۆرینتانیەکە فیلیبی ناوە، گەشت دەکات.

کلیتیمنستر: فیلیب؟ ئاه!

ئێلکتر: پێدەچێ ئێوە لە ناوێکی دیکە بترسێن؟

کلیتیمنستر: ترس؟ ئەگەر شتێکم لە شەکەتی خۆمەوە قازانج کردبێ، ئەوەیە کە ئیدی ئێستە لە هیچ ناترسێم. نزیک کەوە بێگانە، بەخێر هاتی. وەک ئەوەی تۆ گەنجی کەوایە تەمەنت چەندە؟

ئۆرست: هەژدە ساڵ؟

کلیتیمنستر: دایک و باوکت هێشتا زیندوون؟

ئۆرست: باوکم مردووە.

کلیتیمنستر: ئەی دایکت؟ ئەو دەبێ بەنیزیکی هەمان تەمەنی منی هەبێ؟ تۆ هیچ ناڵێی؟ بێگومان بۆ تۆ وا دەردەکەوێ لە من گەنجتر بێ، ئەو دەتوانێ هێشتا پێبکەنێ گۆرانی بچڕێ لە گەڵتا. تۆ خۆشتدەوێ؟ بەڵام وەڵام بدەوە؟ بۆچی جێتهێشتووە.

ئۆرست: دەچم بۆ سپارتە، خۆم لە لەشکری بەکرێگیراوەکان ناونووس دەکەم.

کلیتیمنستر: گەڕۆکەکان لێراهاتوون بیست فەرسەخ بسووڕێنەوە بۆ ئەوەی لە شارەکەمان دووربکەونەوە. کەوایە ئاگاداریان نەکردبوویتەوە؟ خەڵکی پێدەشتەکە ئێمەیان خستۆتە کەرەنتینەوە: ئەوان وەکو ڕشانەوە دەڕواننە پەشیمانییەکانمان، دەترسێن بیانگرێتەوە.

ئۆرست: دەیزانم.

کلیتیمنستر: ئەوان پێیان وتی کە تاوانێکی بێ لێبووردن بووە، ئەوەتا پانزە ساڵە، دەمانهارێ؟

ئۆرست: ئەوان ئەوەیان پێوتم:

کلیتیمنستر: کە شاژن کلیتیمنستر لە هەمووان گوناهبارترە؟ ناوەکەی لەلای هەمووان نەفرەتی لێوە کراوە؟

ئۆرست: ئەوان پێیان وتم.

کلیتیمنستر: لەگەڵ ئەوەشدا تۆ هەر هاتی؟ بێگانە، من کلیتیمنستری شاژنم.

ئێلکترا: سۆز نەتگرێ فیلیب، شاژن وازی بە باری نەتەوەییمان دەکات: باری دانپیانانە ئاشکرایەکان. لێرە، هەر کەسێک هاواری گوناهەکانی خۆی دەکات بەڕووی هەمووماندا، ئەوە دەگمەن نییە لەڕۆژانی پشوودا، بازرگانێک ببینی، دوای ئەوەی شیشەی ئاسنینی دوکانەکەی دەهێنێتە خوارەوە، لەناو شەقامەکاندا لەسەر ئەژنۆیەکانییەوە خۆی بەکێش دەکات، قژەکانی بە تۆز و با دەکات و دەقیژێنێ کە ئەو بکوژە، یەک زیناکارە یان یەک گێرەشێوێنە، بەڵام خەڵکی ئارگۆس خەریکە لە خۆیان وەرس دەبن، هەر یەکە تاوانی ئەوی دیکەی ئەزبەر کردووە. بەتایبەت تاوانەکانی شاژن کەس خۆشنوود ناکات. ئەوانە تاوانی ڕەسمین یان بەشێوەیەکی دیکە تاوانی فۆندا سێونن. لێتدەگەڕێم بیر لە شادیەکەی بکەوە، وەختایەک تۆی ببینی، تەواو گەنج، تەواو نوێ، نەزان هەتاوەکو بەناوی خۆشیەوە: چ هەڵکەوتێکی دەگمەنە! وا پێدەچێ بۆ یەکەم



جار ئیعتراف بکات.

کلیتیمنستر: بێدەنگ بە، هەموو کەسێک دەتوانێ تف بکاتە دەموچاوم و پێم بڵێ تاوانکار و سۆزانی. بەڵام هیچ کەس مافی ئەوەی نییە حوکم بەسەر پەشیمانییەکانمەوە بدات.

ئێلکترا: تۆ دەبینی فیلیب! ئەمە یاسای یارییە. خەڵکی لێت دەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی تۆ تاوانباریان بکەیت. بەڵام چاک لەوە ئاگادار بە تەنها لەسەر ئەو هەڵانە حوکمیان بدە کە دانی پێدادەنێن بۆت: ئەوانی تر کەس بەلایانەوە ناچێ و بۆ تۆ ئەنجامێکی خراپی دەبێ ئەگەر ئاشکرایان بکەیت.

کلیتیمنستر: بەر لە پانزە ساڵ، جوانترین ژنی یۆنانستان بووم. بڕوانە سیمام و حوکم لەسەر ئەوە بدە کە من چەندە ئازارم چەشتووە. بەبێ ڕوولێنان بەتۆی دەڵێم! ئەوە مەرگی پیرەی ئاڵۆش نییە کە پەشیمانم دەکاتەوە! وەختایەک بینیم خوێن لە کەوای گەرماوەکەی دەچۆڕێ لە خۆشیاندا گۆرانیم چڕی، سەمام کرد. ئەمڕۆش هێشتا، دوای پانزە ساڵی ڕابوردوو بەبێ موچڕکەی خۆشی بیری لێ ناکەمەوە. بەڵام من کوڕێکم هەبوو- لە تەمەنی تۆ بوو. وەختایەک ئێگست دای بە سەربازە بەکرێگیراوەکان، من......

ئێلکترا: پێم وایە هەروا کچێکیشتان هەبووە، دایکەکەم کردووتانە بە قاپشۆر. بەڵام ئەم هەڵەیان زۆر بەمێشکتدا نایە.

کلیتیمنستر: ئێلکترا تۆ گەنجی. ئاساییە ئەو کەسەی گەنجە و کاتی نەبووە خراپە بکات سەرزەنشتی ئەوانی دیکە بکات. بەڵام ئارام بگرە. ڕۆژێک دێ، تۆ بەدوای خۆتەوە تاوانێکی بێ لێبووردن بەکێش دەکەی. لەهەر هەنگاوێکدا تۆ پێت وایە لێی دوور دەکەویتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا وەک هەمیشە ئاوەها قورسە بۆ ڕاکیشان کە ئاور دەدەیتەوە لە پشت خۆتەوەی دەبینی، لەو دیو دەستێوەردان، تاریک و پاک وەکو کریستالی ڕەش. هەتا وەکو

چیتر تێی ناگەیت، تۆ دەڵێی: «ئەوە من نیم، ئەوە من نیم ئەوەم کردووە». لەگەڵ ئەوەشدا لێرە دەمینێ، سەد جاریش نکوڵی بکەی، هەمیشە لێرەیە، لە پشتەوە ڕاتدەکێشێ. لە کۆتاییدا دەزانێ کە ژیانی خۆت لەسەر یەک تاکە یاری تەختە نەرد بەستۆتەوە، یەک جار بۆ هەموو جار و، تۆ هیچی تر نییە بیکەی، جگە لە ڕاکێشانی تاوانەکەت نەبێ هەتاوەکو مردنت. ئەمە یاسایە، یاسای پەشیمانبوونەوە، هەق و ناهەق. ئەو کاتە دەبینین کە شکۆی گەنجیت چی بەسەر دێ.

ئێلکتر: شکۆی گەنجیم؟ فەرموو ئەوە گەنجیی خۆتە کە هێشتا زیتر پەشیمانیت وەک لە تاوانەکەت، ئەوە گەنجیمە کە هێشتا زێتر لە بێگوناهییەکەم ئێوە ڕقتان لێدەبێتەوە.

کلیتیمنستر: ئەوەی من لە تۆ ڕقم لێدەبێتەوە، ئێلکتر، ئەوە خودی خۆمە نەک گەنجی تۆ- ئاه نەخێر- ئەوە گەنجی خۆمە.

ئێلکتر: ئەی من، ئەوە ئێوەن، ئێوەن کە ڕقم لێتان دەبێتەوە.

کلیتیمنستر: ئای شوورەیی! ئێمە وەکو دوو ژنی هاوتەمەن نەفرەت لەیەک دەکەین، وەک ئەوەی ناکۆکییەکی خۆشەویستییێکمان هەبێ لەدژی یەکتری، لەگەڵ ئەوەشدا من دایکتم. کوڕی گەنج من نەدەزانم تۆ کێی، نە دەشزانم کە تۆ هاتووی چی بکەی لە نێوانمان، بەڵام ئامادەیی تۆ شوومە. ئێلکتر ڕقی لێم دەبێتەوە، من لەوە بێ خەبەر نیم. بەڵام ئێمە بەدرێژایی پانزە ساڵان بێدەنگیمان پاراست، تەنها تێڕوانینەکانمان خیانەتی لێدەکردین. تۆ هاتووی، تۆ ئێمەت دواند و، ئا ئەمەتا ئێمە ددانەکانمان دەرخستووە و وەکو سەگان هەڕەشە دەکەین. یاساکانی شارەکە لەسەرمان پێویست دەکات میواندارێت لێوە بکەین، بەڵام من لێتی ناشارمەوە، هیوا دەخوازم کە لێرە بڕۆیت. هەرچی سەبارەت بەتۆیە، منداڵەکەم زۆر بەوەفاترین وێنەم خۆشم ناوێی، ئەمە ڕاستە، بەڵام من زێتر لەوە دەستی ڕاستم بە



بڕین چێ لەوەی کە زیان بەتۆ بگەیەنم. تۆ چاک ئەوە دەزانی، تۆ لاوازییەکەم دەقۆزییەوە. بەڵام من ئامۆژگاری ئەوەت ناکەم دژی ئێگست سەری بچووکت هەڵبڕی: ئەو دەزانێ چۆن بە یەک گۆچان وەشانێک گورچیلەی ماران تێکبشکێنێ. بڕوام پێبکە، ئەوە بکە کە فەرمانت پێدەدات، دەنا دەتبرژێنێ.

ئێلکتر: ئێوە دەتوانن وەڵام بۆ پاشا بگێڕنەوە کە من لە ئاهەنگەکە وەدیار ناکەوم. فیلیب تۆ دەزانی چی دەکەن؟ لەو سەرووی شارەکەوە ئەشکەوتێک هەیە ئێمەی گەنج هەرگیز نەمانتوانیوە قووڵاییەکەی ببینین، دەڵێن پێوەندی بەدۆزەخەکانەوە هەیە. کەشیشی مەزن بە بەردێکی گەورە بەستوویە. جا ئیدی تۆ باوەڕ دەکەی! لە هەر یادێکدا گەل لەبەردەم ئەم ئەشکەوتەیە کۆدەبنەوە. سەربازەکان بەتەنیشت ئەو بەردەوە پاڵ دەکەون کە ڕێگەی چوونە ژوورەوەی گرتووە، مردووەکانمان وەک ئەوەی دەڵێن لە دۆزەخەکانەوە سەردەکەون و لەناو شار بڵاو دەبنەوە. پەڕۆیان بۆ دەخەنە سەر مێزەکان، کورسی و قەرەوێڵەیان پێدەدەن، کەمێک پاڵ بەیەکەوە دەنێن تا شوێنیان لە شەوچەرەدا ببێتەوە، ئەوان لە هەموو شوێنێکەوە ڕادەکەن. هەموو شتێک بۆ ئەوانە، تۆ پاڕانەوەی زیندووەکان بهێنە بەر چاو: «مردووە خۆشەویستەکەم، مردووە خۆشەویستەکەم، من نەمویستووە تۆ بریندار بکەم، لێم ببوورە» و بۆ سبەی بەیانی لەگەڵ قووقەی کەڵەشێر دەچنەوە ژێر خاک، بەردەکە دەخەنەوە بەردەم ئەشکەوتەکە، ئەوە کۆتایی دێ تا وەکو ساڵی دادێ. نامەوێ بەشداری لەم بیرەوەرییانەدا بکەم. ئەوانە مردووەکانی ئەوانن نەک هی من.

کلیتیمنستر: ئەگەر تۆ بە دڵخوازی خۆت گوێڕایەڵی نەکەی، پاشا فەرمانی داوە بە زۆر بتهێنن.

ئێلکتر: بە زۆر؟ ها! هە! بەزۆر؟ ئەمەیان چاکە. دایکە چاکەکەم، تکایە

پاشا لە گوێڕایەڵی من دڵنیا بکەوە. لە ئاهەنگەکە دیار دەبم، چونکە گەل دەیەوێ بمبینێ، بێ هیوایان ناکەم. بۆ تۆ فیلیب، تکات لێدەکەم، سەفەرەکەت دوابخە، بەشداری لە ئاهەنگەکەماندا بکە. لەوانەیە تۆ هەلێکی تێدا بدۆزیتەوە بۆ پێکەنین. تا کاتێکی دیکە، دەچم خۆم ئامادە دەکەم.

ئێلکتر: دەردەچێ.

کلیتیمنستر بە ئۆرست: لێرە بڕۆ من دڵنیام کە تۆ بەدبەختیمان بۆ دەهێنی. ناشێ تۆ بەدبەختی ئێمەت بوێ، ئێمە هیچ لەگەڵ تۆ ناکەین. لێرە بڕۆ. لەبەر خاتری دایکتەوە لێتدەپاڕێمەوە لێرە بڕۆ.

(دەردەچێ)

ئۆرست: لەبەر خاتری دایکم

ژووپیتێر دێتە ژوورەوە.

## شانۆی شەشەم

ئۆرست: ژووپیتێر

ژووپیتێر: نۆکەرەکەت خەبەرداری کردم کە بەتەمان دەربچن. ئەو بە بێهوودە بەدوای ئەسپان دەگەڕێ لە هەموو لایەکی شاردا. بەڵام من دەتوانم بەنرخێکی کەم دوو جوانووی بەزینت بۆ پەیدا بکەم.

ئۆرست: چیتر ناڕۆم.

ژووپیتێر، بەهێمنییەوە. چیتر ناڕۆن؟ کەوابوو بەجێت ناهێڵم، ئێوە میوانی منن، لە خوارووی شارەوە ئوتێلێکی چاک هەیە، پێکەوە تێیدا دادەبەزین. ئێوە پەشیمان نابنەوە لەوەی منتان هەڵبژاردووە بۆ هاوڕێیەتی. لە پێشدا- ئەبراکاس، گالە، گالە، تسێ، تسێ- من مێشەکانت لێ پاس دەکەم، پاشانیش پیاوێکی لە تەمەنی من هەر چۆنێک بێ ئامۆژگارییەکانی بەسوودن. من دەتوانم ببمە



باوکت، ئێوە سەربوردەی خۆتانم بۆ بگێڕنەوە. فەرموو کوڕی گەنجم، واز لە کارەکانت بهێنە: چاوپێکەوتنەکانی وەک ئەمە هەندێک جار زۆر بەسوودتر دەبن لەوەی لەپێشدا بۆی دەچین. نموونەی Tele-maque وەربگرە، کوڕی پاشا یۆلیسیس وەک ئێوە دەیزانن. لەڕۆژێکدا چاوی بە پیرە پیاوێک دەکەوێ بە نێوی mentor کە هۆگری دەبێ و لە هەموو شوێنێکەوە بە دوایەوە دەبێ. دوای ئەوە، ئایا دەزانن ئەم mentor مێنتۆرە کێ بوو؟

بەقسەکردنەوە سەرنجی ڕادەکێشێ و پەردە دێتە خوارەوە.

پەردە.

## دیمەنی یەکەم

*پێدەشتێک لەناو چیادا. لەلای ڕاستەوە ئەشکەوتێک دەرگاکەی بە بەردێکی ڕەشی گەورە داخراوە. لەلای چەپیشەوە چەند پەیژەیەک دەگەنە پەرستگایەک.*

## شانۆی یەکەم

خەڵک، پاشان ژووپیتێر، ئۆرست و پەروەردەکار

ژنێک لەبەردەم کوڕە چکۆلانەکەی لەسەر چینچکان دادەنیشێ.

بۆنباغەکەت ئەوە سێ جارە بۆتی دەبەستم. بەدەستەکانی پاکی دەکاتەوە. بەم شێوەیە تۆ پوختەی. زۆر ژیربە و لەگەڵ خەڵکی دیکە بگریە کاتێک پێتدەڵێن بگریە.

منداڵەکە: دەبێ مردووەکان لێرەوە بێن؟

ژنەکە: بەڵێ.

منداڵەکە: دەترسم.

ژنەکە: دەبێ بترسێی خۆشەویستەکەم. ترسێکی گەورە. بەم شێوەیە دەبێ بەپیاوێکی بەڕەوشت.

پیاوێک: ئەمڕۆ بۆ ئەوان هەواکەی خۆش دەبێ.

یەکێکی دیکە: خۆشبەختانە! دەبێ لەو باوەڕەدابین کە ئەوان هێشتا هەست بەگەرمایی خۆرەتاو بکەن. پارساڵ باران بوو ئەوان... تۆقێنەر بوون.

یەکەم: تۆقێنەر.

دووەم: مەخابن.

سێیەم: وەختایەک ئەوان دەگەڕێنەوە ناو کونەکانیان و ئێمە تەنیا جێدەهێڵن، بەینی خۆمان بێ، من بەپەلە دێمەوە ئێرە، دەنوارمە ئەم بەردە و بە خۆم دەڵێم «ئەوەتا لە ئێستەوە تا یەک ساڵی دیکە تەواو».



چوارەمین: بەڵێ؟ ئێ ئەوهایە، من دڵم بەمە ئاو ناخواتەوە. لە سبەینێوە دەست دەکەم بەخۆم دەڵێم: «ساڵانی دادێ دەبێ چۆن بن؟ ئەوان ساڵ لەدوای ساڵ بەدتر دەبن».

دووەم: بێدەنگ نەگبەت. نەوەک یەکێک لەوان لە کەلێنی شەقارە بەردێکەوە دزە بکا و ئێستە لەنێوان ئێمەدا بسووڕێتەوە... مردوو هەن بەپێش وادە دەکەونەوە.

بەنیگەرانییەکەوە سەیری یەکتر دەکەن.

ژنێکی گەنج: ئەگەر هەر هیچ نەبوایە ئێستە دەستی پێکردبوایە. ئەوانەی ناو کۆشک چ دەکەن؟ ئەوان پەلە ناکەن. من وای دەبینم ئەم چاوەڕوانیکردنە سەختترین شتە: ئێمە لێرەین، لەژێر ئاسمانێکی ئاگر ڕێدەکەین بێ ئەوەی چاوان لەسەر ئەم بەردە ڕەشە هەڵبگرین... ها! ئەوان ئا لەوێن لەپشتەوە، ئەوان وەکو ئێمە چاوەڕوانن، هەموویان کەیفسازن بەوەی ئازار بەئێمە دەگەیەنن.

پیرەژنێک: چاکە، گەپجاڕ! ئێمە دەزانین چ شتێک ئەم ژنە دەترسێنێ.

بەهاری ڕابوردوو پیاوەکەی مردووە، ئا ئەوەتا دە ساڵە ئەم ژنە شاخی لە پیاوەکە بەستۆتەوە.

ژنە گەنجەکە: بێگومان، بەڵێ، من دانی پێدادەنێم ئەوەندەی توانیبێتم دەسخەڕۆم داوە، بەڵام من خۆشم دەویست و ژیانێکی خۆشنوودم پێدا. ئەو هەرگیز لە هیچەوە بەگومان نەبووە! لەکاتێکدا دوو سرنجی بەوەفای سەگانەی لێدام، مرد. ئەو ئێستە هەموو شتێک دەزانێ، کەیفسازییەکەیان لێ تێکدا، ئەو ڕقی لێمە، ئازار دەچێژێ. تاوێکی دیکە دەکەوێتە بەرامبەر من، جەستە بۆن سیگاراوییەکەی بەجەستەمەوە دەلکێ. ئاوەها خۆم پێوە دەلکێنێ کە هیچ زیندوویێک هەرگیز ئاوەهای نەکردبێ. ئاه! دەیبەمەوە لای خۆم. وەکو فرفرۆک بە دەوری ملمەوە دەسووڕێتەوە. خواردنێکی خۆشم بۆ ئامادەکردووە، ئاردە شیرینی، یەک ژەمە خواردنی سووک

و چاک وەک ئەوەی ئەو حەزی پێ دەکات. بەڵام هیچ شتێک دڵە ڕەقەکەی نەرم ناکاتەوە و ئەم شەوە... ئەم شەوەیان، لەناو پێخەفەکەم دەبێ.

پیاوێک: ئەو ژنە لەسەر هەقە بەقەسەم. ئێگست چی دەکات؟ بیر لە چی دەکاتەوە؟ من ناتوانم بەرگەی ئەم چاوەڕوانییە بگرم.

پیاوێکی دیکە: کەوایە تۆ بۆ خۆت شکات بکە! تۆ لەو باوەڕەدای کە ئێگست لە ئێمە کەمتر بترسێ؟ بدوێ. دەتەوێ بچیتە شوێنی ئەو و بیست و چوار کاتژمێر لەگەڵ ئاگامەمنوون بەرەوڕوو بیتەوە؟

ژنە گەنجەکە: تۆقێنەرە، تۆقێنەرە چاوەڕوانی. پێم وایە ئێوە هەمووتان بە هێمنییەوە خۆتان لە من وەدوور دەخەنەوە. بەردەکە هێشتە لانەبردراوە، هێشتا هەر یەکێک لە ئێمە نێچیری مردووەکانی خۆیەتی، تەنیا وەکو دڵۆپە بارانێک.

ژووپیتێر، ئۆرست و پەروەردەکار دێن.

ژووپیتێر: بێرەدا وەرن، باشتر دەبێ.

ئۆرست: ئا ئەوەتانەن، خەڵکانی ئارگۆس، دەستوپێوەندە بەوەفایەکانی پاشا ئاگامەمنوون؟

پەروەردەکار: ئەوانە چەند ناشیرینن! دەبینی گەورەم، ڕەنگیان لە مۆم و چاویان بەقووڵدا چووە. ئەم خەڵکانەی ئێرە خەریکە لەترسانا بمرن. ئا ئەوەتا نیشانەی پرووپووچیان پێوەیە. لێیان بنۆڕە، چاویان بدە. ئەگەر......

ژووپیتێر: ئێ ئەوجا جوانییەکەت بەکەڵکی چی دێت، چەند گوڵە بەیبوونێک لەسەر گۆناکانت، کەسە سادە و ساکارەکەم، ئەوە ڕێگەت لێ ناگرێ ببیتە پەین، وەک هەموو ئەوانە لە بەرچاوی ژووپیتێر.

برۆ، تۆ بۆنێکی گەنیوت لێدێ و تۆ پێی نازانی. هەڵبەت ئەوان لووتیان پڕییە لە بۆنی تایبەتی خۆیان، ئەوان لە تۆ چاکتر خۆیان دەناسن.



(خەڵک تێکدەقژقژێن)

پیاوێک، سەرکەتووە بەسەر پەیژەکانی پەرستگەکە، خەڵک دەدوێنێ.

دەتانەوێ شێتمان بکەن؟ با دەنگەکانمان یەکبخەین هاوڕێیان، با بانگەوازی ئێگست بکەین، ئێمە ناتوانین بەرگەی ئەوە بگرین کە ڕێورەسمەکە لەوە درێژخایەنتر بێت.

خەڵکەکە: ئێگست! ئێگست! بەزەیی!

ژنێک: ئاه بەڵێ! بەزەیی! هیچ کەس ناتوانی ڕەحم بە من بکات!

هاکا دیتتان ئەو بەخۆی و قورگی کراوەیەوە هات، ئەو پیاوەی کە هێندە ڕقم لێدەبێتەوە، دەمەخاتە ناو باوەشە نەبینراو و حەپەساوەکانی خۆی. بەدرێژایی شەو دەبێتە ئاشقی من، بەدرێژایی شەو.

ها!

(ژنەکە لەخۆی دەبوورێتەوە)

ئۆرست: چ شێتییێکە! دەبێ بەو خەڵکە بوترێ...

ژووپیتێر: هێی، چیتە کوڕی گەنج، ئەو هێندە هاتوهاوارە بۆ ژنێک کە لەخۆی دەبوورێتەوە؟ ئێوە ڕێکەوتی ئافرەتی دیکەش دەکەن.

(پیاوێک دەچیتە سەر ئەژنۆ)

من گەنیوم! من گەنیوم! من کەلاکێکی ناپاکم. بنۆڕن مێشەکان وەکو داڵ بەسەر منەوەن! گاز بگرن، کونبکەن پێوە بدەن. مێشە تۆڵەسێنەکان ڕۆچنە ناو گۆشتەکانەوە تاوەکو دڵە پیسەکەم. من گوناهم کرد، من سەد جار گوناهم کرد، من پیسم، من یەک چاڵی پیساییم.

ژووپیتێر: هۆ پیاوی چاک!

پیاوەکان هەڵیدەستێننەوە.

باشە، باشە. تاوێکی دیکە تۆ چاوت پێدەکەوێ وەختایەک ئەوان

دەگەنە ئێرە پیاوەکە گرفتار دەمینێتەوە، بەچاو سوورانەوەیەکەوە
فیکە لێدەدات.

خەڵک: ئێگست! ئێگست. بەزەیی، فەرمانبدە تا دەستپێبکەن. ئێمە چیتر بەرگە ناگرین. ئێگست لەسەر پەیژەکانی پەرستگەکەوە وەدیار دەکەوێ، لە پێشەوەیشی کلیتیمنستر و کەشیشی مەزن. پاسەوانەکان.

## شانۆی دووەم

هەمان کەسەکان، ئێگست، کلیتیمنستر، کەشیشی مەزن، پاسەوانەکان.

ئێگست: سەگەکان! ئێوە زات دەکەن سکاڵا بکەن؟ ئایا ئێوە یادەوەرییە سووکەکانتان لەبیرکردووە؟ قەسەم بە ژووپیتێر، بیرەوەرییەکانتان دەبووژێنمەوە (رووی خۆی بەرەو کلیتیمنستر وەردەگێڕێ). دەبوایە ئێمە بەبێ ئێلکتر دەستمان پێبکردبوایە. بەڵام دەبێ ئێلکتر وریا بێ سزاکەم بێ هاوتا دەبێ.

کلیتیمنستر: ئێلکتر وادەی پێدام کە گوێڕایەڵی بکات. من دڵنیام خۆی ئامادە دەکات، دەبێ لەبەرامبەر ئاوێنەکەی دواکەوتبێ.

ئێگست، بۆپاسەوانەکان:

برۆن ئێلکتر لە کۆشکەوە بهێننە ئێرە، بەخۆشی و ترشی بێ، (پاسەوانەکان دەرچوون، بەناو خەڵکەکەدا). بۆ شوێنی خۆتان. پیاوەکان بۆ دەستە ڕاستم. ژن و منداڵەکانیش بۆ دەستە چەپم. چاکە.

(بێدەنگییەک. ئێگست چاوەڕوانە)

کەشیشی مەزن:

ئەم خەڵکانە لێرە ناتوانن پتر بمێننەوە.

ئێگست: دەزانم. ئەگەر پاسەوانەکان.....



پاسەوانەکان دێنە ژوورەوە.

پاسەوانێک: گەورەم. هەموو شوێنێک گەڕاین بەدوای شاژن. بەڵام کۆشک چۆلوهۆڵە.

ئێگست: چاکە. بەیانی ئەم هەق و حسابە پاک دەکەینەوە (بۆ کەشیشی مەزن) دەستپێبکە.

کەشیشی مەزن:

بەردەکە لابەرن.

خەڵکەکە: ها!

(پاسەوانەکان بەردەکە لادەبەن. کەشیشی مەزن خۆی دەباتە پێشەوە تا ئاستانەی ئەشکەوتەکە)

کەشیشی مەزن:

ئێوە لەبیرکراوەکان، لەیادکراوەکان، ناکامەکان، ئێوە کە لەسەر رووی زەوی دەخشێن، لە ناو تاریکاییدا وەکو دوکەڵی بورکانەکان، چیتر تان بۆ نەماوەتەوە جگە لە ڕق و تووڕەیی گەورەتان، ئێوە مردووەکان ڕابن، ئەوە جەژنی ئێوەیە!

فەرموون سەربکەونە سەر زەوی وەکو هەڵمێکی فرە گەورەی گۆگرد کە (با) ڕاوی بکات. لە هەناوی جیهان وەرنە دەرەوە، هۆ مردووەکان، سەد جار مردوو، ئێوە کە هەموو ترپەی دڵەکانمان واتان لێدەکات سەرلەنوێ بمرنەوە. ئەوە بەتووڕەیی و تاڵییەوە، بەگیانی تۆڵەسەندنەوە، ئەز لێتان دەپاڕێمەوە وەرن تووڕەییتان بەزیندووەکان هەڵبڕێژن! وەرن تەمتومانێکی خەست بەناو شەقامەکانمان پەرت بکەن. تاقمەکانتان فشار بێنن بخزێنە نێوان دایک و زارۆکەوە، نێوان ئاشق و گراوەکەی. وامان لێبکەن پەشیمان بینەوە کە نەمردووین. ڕابن، خوێنمژەکان، کرمەکان، تارماییەکان، دێوەکان، تۆقینی شەوانمان. ڕابن هۆ ئەو سەربازانەی کە بەگومڕایی مردن ڕابن بەدبەختەکان، زەلیلەکان، ڕابن

مردووەکانی برسێتی کە هاواری سەرەمەرگتان بۆتە یەک نەفرەت. دەبینن، زیندووەکان لێرەن، نێچیرە قەڵەوە زیندووەکان! ڕابن.. باو و بۆرانیان بەسەردا ببارێنن، تا ناخی ئێسک بیانماشنەوە و ڕابن! ڕابن! ڕابن!

دەهۆڵ دەنگێوێ. لەبەردەم ئاستانەی ئەشکەوتەکە سەما دەکات، سەرەتا بەهێمنی، پاشان بەرە بەرە خێراتر و لەهیلاکیان بەردەبێتەوە.

ئێگست: ئەوان لێرەن!

خەڵکەکە: تۆقین!

ئۆرست: ئەوەندە بەسە من دەچم......

ژووپیتێر: بنۆڕە من، کوڕی گەنج، لە بەرامبەر، لەوێ لەوێ تێم بڕوانە! تێگەیشتی. ئێستاکە بێدەنگ بە.

ئۆرست: ئێوە کێن؟

ژووپیتێر: تاوێکی دیکە دەیزانی.

ئێگست: بە هێمنی لە پەیژەکانی کۆشکەوە دادەبەزێ.

ئێگست: ئەوان لێرەن (بێدەنگییەک). ئەو لێرەیە، ئاریسی مێردەکەت کە تۆ کردبووتە گەپجاڕ. ئەو لێرەیە، لەبەرامبەر تۆ، لەباوەشت دەکات. وەک ئەوەی تەوقەت لەگەڵدا دەکات. هەر وەک ئەوەی خۆشتی دەوێ، وەک ئەوەی ڕقی لێت دەبێتەوە! ئەویشیان لێرەیە، خاتوو نیسیاسی دایکت کە لەبەر بێ بایەخی مرد. ئەی تۆ سێگێست، سووخۆری شوورەیی، ئەوان لێرەن، هەموو قەرزارە بەدبەختەکانت، ئەوانەی کە لە کوێرەوەریدا مردن و ئەوانەی کە خۆیان لەسێدارەدا، چونکە تۆ ئیفلاست پێکردن. ئەوان لێرەن و ئەوان ئەمڕۆکە قەرزخوازی تۆن. ئەی ئێوە، دایک و باوکەکان، باوکە دڵناسکەکان، کەمێک چاوتان داخەن، دوورتر بڕوانن، بەرەو خۆر: ئەوان لەوێن، زارۆکە مردووەکان، دەستە چکۆڵەکانیان درێژ دەکەن و هەموو ئەو خۆشنوودییانەی ئێوە لێتان بێبەری کردوون، هەموو



ئەو ئەشکەنجانە ئێوە بۆتانهێناون، وەکو قورقوشم بەسەر ڕۆحە چکۆڵە پڕ قین و خەمگینەکانیان دەکەوێ.

خەڵکەکە: بەزەیی!

ئێگست: ئاه، بەڵێ! بەزەیی! نازانن کە مردووەکان هەرگیز بەزەییان نییە؟ سکاڵاکانیان ناسڕێتەوە، چونکە حەق و حسابیان بۆ هەتا هەتایە ڕاوەستاوە. نیسیس. ئایا تۆ دەتوانی بەکردەیەکی چاک ئەو خراپەکارییە ڕەشبکەیتەوە کە دەرهەق دایکت کردووتە؟ بەڵام چ کردەیەکی چاک دەتوانێ بۆ هەتا هەتایە بەهاواری بگات؟ ڕۆحەکەی نیوەڕۆیەکی زەردەگرە، بەبێ هیچ شنە بایەک، هیچ شتێکی تێدا ناجوولێت، هیچ شتێکی تێدا ناگۆڕێت، هیچ شتێکی تێدا ناژی، یەک خۆرەتاوی کزە، یەک خۆری نەجوولاوەیە، کە هەتا هەتایە وێرانی دەکات. مردووەکان لێرە نین- ئێوە ئەم وشە سەرسەختە دەزانن؟ ئەوان چیتر لێرە نین، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئێوە خۆتان کردۆتە پاسەوانی بێ غەل و غەشی تاوانەکانتان.

خەڵکەکە: بەزەیی!

ئێگست: بەزەیی؟ ئاه! گەپجاڕی کۆمیدییانە، ئێوە ئەمڕۆ خەڵکتان هەیە. ئێوە هەست بە قورسایی ئەو ملوێنەها چاوە چەقیو و بێ هیوایانە ناکەن بەسەر ڕوخسار و دەستەکانتانەوە؟ ئەوان ئێمە دەبینن. ئەوان ئێوە دەبینن، ئێمە لەبەردەم ئاپۆرەی مردووەکان ڕووت و قووتین. ها! ها! ئەوەتانێ ئێوە ئێستە چاکتر سەرگەردان بوون، ئەو ڕوانینە نەبینراو و پاکە دەتانسووتێنێ، کە جێگیرترە وەک لە بیرەوەرییەکی ڕوانین.

پیاوەکان: بمانبەخشن لە زیندوویمان لەکاتێکدا ئێوە مردوون.

ژنەکان: بەزەیی، ئێمە بەڕوخسارەکان و شتەکانی ئێوەوە ئاپۆرە دراوین. ئێمە بەرگی پرسەی هەمیشەیی ئێوەمان پۆشیوە و لە بەرەبەیانەوە

تا شەو و لە شەویشەوە تا بەرەبەیان دەگرین. هەموو هەوڵێکمان دا، بەڵام بیرەوەرییەکانتان لە نێوان پەنجەکانماندا لەبەر یەک هەڵدەوەشێتەوە و دەخلیسکێ، هەموو ڕۆژ کەمێک زێتر زەردهەڵدەگەڕێ و، ئێمەش کەمێک گوناهبارتر. ئێوە ئێمە جێدەهێڵن و جێمان دەهێڵن، ئێوە وەکو خوێن دارِسان دەڕژێنە ناو ئێمەوە. بەڵام ئەگەر ئەمە گیانە توورەکانتان هێور بکاتەوە، بزانن، هۆ خۆشەویستە ونبووەکانمان، کە ئێوە ژیانی ئێمەتان بەفیڕۆ دا.

پیاوەکان: لێمان ببوورن کە ئێمە زیندووین، لە کاتێکدا ئێوە مردوون.

منداڵەکان: بەزەیی! ئێمە بە ئەنقەست لەدایک نەبووین، ئێمە هەموومان خەجاڵەتین لە گەورە بوون. ئێمە چۆن دەتوانین هەستتان بریندار بکەین؟ بنۆڕن ئێمە بەسەختی دەژین، ئێمە لەڕین، ڕەنگ زەرد و تەواوێک چکۆڵە. ئێمە دەنگە دەنگ ناکەین، ئاوەها دەخلیسکێین هەتاوەکو هەوای دەوروبەریشمان ناشێوێنین.

ئێمە لە ئێوە دەترسین، ئۆی! ترسێکی چەند گەورە!

پیاوەکان: بمانبەخشن کە ئێمە زیندووین لە کاتێکدا ئێوە مردوون.

ئێگست:

هێمنی! هێمنی! ئەگەر ئێوە هەروا بکرووزێنەوە، کەوایە منی پاشاتان چی بڵێم؟ چونکە ئازارەکەم دەستیپێکردووە: خاک دەلەرزێ و هەوا تاریک دادێ؛ مردووە لە هەمووان گەورەترەکان، ئاگامەمنوون ئەوەی من بەدەستەکانم کوشتم وەدیار دەکەوێ.

(ئۆرست، شمشێرەکەی دەکێشێتەوە)

پیس و چەپەڵ! ڕێگەت پێنادەم ناوی باوکم تێکەڵ بە مەیموونچییەکان بکەیت!

(ژووپیتێر دەیگرێ بە خۆیەوە تەوقی دەکات)

بوەستە، کوڕی گەنج، بوەستە!

ئێگست ڕووی خۆی وەردەگێڕێ.



کێ جورئەت دەکات؟ (ئێلکتر لەناو کەوایەکی سپیەوە لەسەر پەیژەکانی پەرستگەکەوە وەدیار دەکەوێ. ئێگست دەبینێ)

ئێلکترا!

خەڵکەکە:

ئێلکترا!

## شانۆی سێیەم

هەمان کاراکتەرەکان، ئێلکتر

ئێگست: ئێلکتر، وەڵام بدەرەوە، ئەم جلوبەرگە چی دەگەیەنێ؟

ئێلکتر: جوانترین ڕۆبم لەبەر کردووە، ئایا ئەمڕۆ جەژن نییە؟

کەشیشی گەورە: تۆ هاتووی سووکایەتی بەمردووەکان بکەیت؟ ئەمە جەژنی مردووەکان خۆیانە، تۆ زۆر چاک ئەمە دەزانی و دەبوایە تۆ جلی ڕەشی تازیەت لەبەر بکردبوایە.

ئێلکتر: جلی ڕەشی تازیە؟ ڕەشپۆشی، بۆ؟ من لە مردووەکانی خۆم ناترسم و کارێکیشم بەمردووەکانی ئێوەوە نییە!

ئێگست: تۆ ڕاستت وت، مردووەکانی تۆ مردووی ئێمەنین. لێی بڕوانن لەناو ڕۆبێکی سۆزانیەتیدا، کچە چکۆڵانەکەی ئاتریێ، کە ترسنۆکانە سەری برازایەکانی خۆی بڕی، کەوایە تۆ چیت، ئەگەر دوا فرێدراوی ڕەگەزێکی نەفرەتلێکراو نەبی! من دڵم پێت سووتا و تۆم لەناو کۆشکەکەمدا بەخشی، بەڵام ئەمڕۆ دان بەهەڵەکەمدا دەنێم، چونکە تۆ هەمیشە خوێنی کۆنی گەنیوی ئاتریدەکان بەناو دەمارەکانتدا هاتوچۆ دەکات و، تۆ هەمووومان دەتەنیەوە ئەگەر ڕادەیەکت بۆ دانەنێم. سەگە؛ کەمێک حەوسەڵەت هەبێ دەبینی کە من دەزانم سزا بدەم. چاوەکانت بەشی گریان ناکەن.

خەڵکەکە: گڵاوە!

ئێگست: گوێت لێیە، نەگبەت لە گرموهۆڕی ئەم گەلە کە هەستت بریندار

کردووە، گوێت لێیە چ ناوێکیان لێتناوە؟ ئەگەر من لێرە نەبوومایە بۆ جلەوکردنی تووڕەیییەکەیان، هەر لەم شوێنە دەمودەست پارچە پارچەیان دەکردی.

خەڵکەکە: گلاو!

ئێلکتر: تۆ بڵێی ئەمە گلاو بێ کە من دڵشادم؟ ئەی ئەوان بۆچی دڵشاد نین؟ کێ ڕێگەی لێ گرتوون؟

ئێگست: پێدەکەنێ و باوکە مردووەکەیشی لێرەیە، دەموچاوی خوێنی لێ کۆبۆتەوە.

ئێلکتر: چۆن جورئەتتان کرد لەبارەی ئاگامەمنوونەوە قسە بکەن؟

دەزانن ئەگەر شەو نەهات و قسە نەچرپێنێتە گوێم؟ دەزانی وشەکانی خۆشەویستی و حەسرەتە، دەنگە گڕ و شکاوەکەی دەچرپێنێتە گوێم؟ من پێدەکەنم. ئەمە ڕاستە، بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا من پێدەکەنم، من بەختیارم. پێتان وا نییە کە بەختیارییەکەم دڵی باوکم شاد ناکات؟ ئاە! ئەگەر لێرە بوایە، ئەگەر کچەکەی دەبینی لەناو ڕۆبێکی سپی، کچەکەی کە ئێوە هێناتانە ڕیز کۆیلەیەکی سووک و چرووک، ئەگەر دەبینێ کچەکەی سەری بەرزە و بەدبەختی سەری پێنەچەماندۆتەوە، من بێگومانم ئەوەی بە بیرنایە نەفرەتم لێبکات، چاوە بریسکەدارەکان لە سیما شەکەت و لێوە خوێناوییەکانیەوە هەوڵدەدەن زەردەخەنە بگرن.

ئافرەتێکی گەنج: جا ئەگەر ئەو کچە ڕاستی بڵێ؟

دەنگەکان: بەڵام نا، ئەو کچە شێتوویێتە، ئێلکتر بەخێری خۆت لێرە برۆ، دەنا گاوریەکەت بەسەر ئێمەدا دەشکێتەوە.

ئێلکتر:کەوایە ئێوە لە چی دەترسن؟ من چاو دەدەمە دەوروبەری ئێوە جگە لە سێبەرەکانتان هیچی تر نابینم. گوێ لەمە بگرن کە هەر ئێستە فێری بووم و لەوانەیە ئێوە نەیزانن: لە یۆنانستان چەندین شاری بەختیار هەن. شاری سپی و هێمن کە وەکو مارمۆتک لە



بەرخۆرەتاو گەرم دەبنەوە. لەم کاتەدا لەژێر هەمان ئاسماندا، منداڵەکان لە گۆڕەپانی کۆرینتادا یاری دەکەن. دایکەکانیشیان بەهیچ شێوەیەک داوای بەخشیش ناکەن، چونکە هێناویانەتە دونیاوە. بەزەردەخەنەیەکەوە چاویان لێدەکەن، شانازییان پێوە دەکەن.

هۆ دایکانی ئارگۆس، ئەوە دەزانن؟ ئایا دەتوانن هێشتا لە شکۆی ژنێک بگەن کە دەڕوانێتە منداڵەکەی و دەڵێ:

«ئەمە من بووم لەناو سکی خۆم هەڵمگرتبووی؟».

ئێگست: دواجار تۆ بێدەنگ نابی، یان وشەکان بخەمەوە ناو قوڕگتەوە.

چەند دەنگێک لەناو خەڵکەوە.

بەڵێ، بەڵێ، با بێدەنگ بێ! بەس، بەسە!

چەند دەنگێکی دیکە.

نەخێر، لێیگەڕێن با قسە بکات! لێبگەڕێن با قسە بکات، ئەوە ئاگامەمنوون خۆی ئیلهامی پێداوە.

ئێلکتر: هەوا خۆشە. لە هەموو شوێنێکەوە، لە دەشتەوە پیاوان سەریان شۆڕدەکەنەوە و دەڵێن: «هەوا خۆشە، کەیفسازن. هۆ جەللادی خودی - خۆتان، ئایا ئەم قەناعەتە متەوازعەی ئەو جوتیارەتان لە یاد چوو کە لەسەر زەوییەکەی دەڕوات و دەڵێ:

هەوا خۆشە؟» ئا ئەوەتا ئێوە دەستەکانتان شۆڕکردۆتەوە سەر بەرەو خوار بە ئاستەم هەناسە دەدەن. مردووەکانتان بە دەورتانەوە دەلکێن. ئێوە نیشتەنی نەجوولاوەن، لەترسی ئەوەی نەوەکا کەمترین جوولە پاڵیان پێوە بنێ، ئەوە ترسناکە، وا نییە؟ ئەگەر دەستەکانتان لە ناکاوێکەوە بەر هەڵمێکی شێدار بکەوێ ئەوە ڕۆحی باوکت یا هی پێشینەکەتە؟

بەڵام چاو بدەنە من: من دەستەکانم درێژ دەکەم، شۆڕیان دەکەمەوە و خۆم لێک دەکێشمەوە وەک چۆن مرۆ لە خەو هەڵدەستێ،

شوێنەکەم لەبەر خۆرەتاو دەگرم، هەموو شوێنەکانم. ئایا ئاسمان بەسەر سەرم دەڕمێ؟ چاو بدەنە من دەبینن من سەما دەکەم، جگە لە گڤەی (با) کە بەر قژم دەکەوێ هەست بە هیچی دیکە ناکەم. مردووەکان لەکوێن؟ ئێوە بڕوا دەکەن کە ئەوان لەسەر ڕیتم لەگەڵ منا سەما دەکەن.

کەشیشی گەورە.

خەڵکی ئارگۆس، بە ئێوە دەڵێم ئەم ژنە گڵاوە، بەدبەخت خۆیی و ئەو کەسەش لەئێوە کە گوێی لێدەگرێ.

ئێلکتر: هۆ مردووە خۆشەویستەکانم، ئێڤگینی خوشکە گەورەکەم، ئاگامەمنوون، تاکە پاشام، گوێ لە پاڕانەوەکەم بگرن.

ئەگەر من گڵاوم، ئەگەر ڕۆحی پڕ سوێتان بریندار دەکەم هێمایەکم بۆ بکەن، بە پەلە هێمایەکم بۆ بکەن، بۆ ئەوەی بیزانم.

بەڵام ئەگەر پشتگیریم دەکەن خۆشەویستەکانم کەوایە بێدەنگ بن تکاتان لێدەکەم گەڵایەک نەبزوێ، تاقە گیایێک، نە هەرایەک سەما پیرۆزەکەم لێ تێکبدات: چونکە من سەما بۆ شادی دەکەم، سەما بۆ ئاشتی مرۆڤەکان دەکەم، سەما بۆ بەختیاری و بۆ ژیان دەکەم. هۆ مردووەکانم، داوای بێدەنگیتان لێدەکەم، بۆ ئەوەی ئەوانەی لە دەوروبەرمەوەن بزانن کە دڵتان لەگەڵ مندایە.

ئێلکتر سەما دەکات.

دەنگ لەناو خەڵکەکەوە:

ئەو سەما دەکات! چاوی لێکەن، سووک وەکو بریسکە، ئەو سەما بۆ خۆر دەکات، وەکو قوماشی شەکاوەی ئالایەک و مردووەکانیش بێدەنگ بوون.

ژنە گەنجەکە:

چاو بدەنە نەشوەکەی، نەخێر ئەمە سیمای گومڕاییێک نییە، کەوایە، ئێگست، ئێگست! تۆ هیچ شتێک ناڵێی، بۆچی وەڵام



نادەیتەوە؟

ئێگست: لەگەڵ گێل و گەلۆر گفتوگۆ دەکرێ؟ ئێمە دەیانڕووخێنین! جاران من هەڵە بووم دەمپاراست، بەڵام ئەمە هەڵەیەکە ڕاست دەکرێتەوە: مەترسن، لەگەڵ زەوی دەیپلیشێنمەوە و ڕەگوڕیشەی هەڵدەکێشم.

خەڵکەکە: هەڕەشەکردن وەڵامدانەوە نییە، ئێگست! قسەی دیکەت پێ نییە پێمان بڵێی؟

ژنە گەنجەکە: ئەو سەما دەکات، ئەو دەخەنێ و بەختیارە، وەک ئەوەی مردووەکان بیپارێزن. ئاها! ئێلکتر فرە شاگەشکەیە. بنۆڕە منیش هەروا، باڵەکانم لەیەک درێژ دەکەمەوە و گەرووم دەدەمە بەر خۆرەتاو!

دەنگ، لەناو خەڵکەکەوە.

مردووەکان بێدەنگ بوون، ئێگست تۆ درۆت لەگەڵ کردین.

ئۆرست: ئێلکتری خۆشەویست.

ژووپیتێر: قەسەم بەهەق، لێوی ئەم منداڵکارە دەبڕم (دەستی درێژ دەکات). پۆزیدۆن کاریبۆ کاریبۆن لیولابای.

ئەو گابەردە زلەی دەروازەی ئەشکەوتەکەی گرتبوو بەتەقە تەق لەبەردەم پەیژەکەوە دەجوولێتەوە. ئێلکتر لە سەماکردن دەوەستێ.

خەڵکەکە: تۆقێن!

(بێدەنگییەکی درێژ)

کەشیشی گەورە: هۆ گەلی ترسنۆک و زۆر سووک: مردووەکان تۆڵەی خۆیان دەسێننەوە! چاو بدەن مێشەکان گەردەلوولێکی چڕو پڕیان بەسەر ئێمەوە دروستکردووە! گوێتان لە دەنگێکی گڵاو بوو و نەفرەتی لێکردین!

خەڵکەکە:

ئێمە هیچمان نەکردووە، ئەمە هەڵەی ئێمە نییە، ئەو هات بە قسە

ژاراوییەکانیەوە ئێمەی ڕاکێشا! بۆ ڕووبار، بۆ جادووبازی، بۆ ناو ڕووبار، بۆ سووتان.

پیرەژنێک هێما بۆ ژنە گەنجەکە دەکات.

ئەمەیان ئاخاوتنەکانی وەکو هەنگوین دەخوارد، جلەکانی لەبەر داکەنن، تەواو ڕووتی کەنەوە و تێر شەقی بکەن تا خوێنی لەبەر دەڕوات.

پەلامار دەدەنە سەر ژنە گەنجەکە، پیاوەکان بەسەر پەیژەکان دەکەون و تاو بۆ لای ئێلکتر دەبەن.

(ئێگست هەڵدەستێتەوە)

بێدەنگ بن سەگەکان. بەڕیزەوە بڕۆنەوە شوێنەکانتان و ئەرکی سزادانەکە بۆ من لێبگەڕێن (بێدەنگییەک). ئەی ئێستە؟. بینیتان ئاکامی بەگوێنەکردنم چۆن شکایەوە؟ ئێستا گومان لە سەرۆکەکەتان دەکەن؟

بگەڕێنەوە شوێنی خۆتان، مردووەکان هاوەڵیتان دەکەن بەدرێژەی شەو و ڕۆژ میوانتان دەبن. لەسەر مێز شوێنیان بکەنەوە، لە ئاگردانەکانتانەوە، لەناو پێخەفەکانتانەوە، هەوڵبدەن ڕەوشتی نموونەییتان هەموو ئەمانەیان لەبیر بباتەوە. هەرچی سەبارەت بەمنە وێڕای ئەوەی کە سکاڵاکانتان برینداریان کردم، بەڵام من لێتان دەبوورم.

بەڵام تۆ ئێلکتر......

ئێلکتر: بەڵام من چی؟ من زەربەی خۆم لەدەستچوو، جارێکی دیکە باشتری دەکەم.

ئێگست: من دەرفەتت پێنادەم. یاساکانی شار ڕێگەی ئەوەم لێدەگرن لەم ڕۆژانەی جەژن سزا بدەم. تۆ ئەمە دەزانی و تۆ تێتپەڕاندووە. بەڵام تۆ چیتر خەڵکی شار نیت، شاربەدەرت دەکەم. بە پێ خاوسی و بەبێ جانتا، لەگەڵ ئەم ڕۆبە شوورەییەی بەبەرتەوەیە. ئەگەر تۆ



بەیانی تا گزینک لەناو دیوارەکانمان مایتەوە، فەرمان بە یەکێک دەدەم وەکو مەڕێکی گەڕ سەرت ببڕێ.

(دەردەچێ، پاسەوانەکان بەشوێنیەوە. خەڵکەکە لەبەردەم ئێلکتر دەڕۆن و مشتی بۆ هەڵدەبڕن)

ژووپیتێر بۆ ئۆرست

کەوایە گەورەم ئایا پەندتان وەرگرت؟ ئەمەیان مێژوویێکی ئەخلاقییە، کە من بە تەواوی بەهەڵەداچووم: خراپەکان سزادران و باشەکانیش پاداشکران (ئیشارە بە ئێلکتر دەکات). ئەم ژنە......

ئۆرست:

ئەم ژنە خوشکی منە، پیاوی ساویلکە، بڕۆ لاچۆ، دەمەوێ قسەی لەگەڵدا بکەم.

(ژووپیتێر تاوێک تەماشای دەکات، پاشان شانەکانی دەهێنێتە خوارەوە)

هەروەک چۆن تۆ دەتەوێ.

(دەردەچێ، پەروەردەکار بەدوایەوە)

شانۆی چوارەم

ئێلکتر لەسەر پەیژەی پەرستگەکەیە، ئۆرست.

ئۆرست: ئێلکتر!

ئێکلتر: (سەری بەرز دەکاتەوە تەماشای دەکات). ئاه، ئەوە تۆی فیلیب؟

ئۆرست: ئێلکتر تۆ ناتوانی چیتر لەم شارەدا بژی، تۆ لە مەترسیدای.

ئێلکتر: لە مەترسی؟ ئاه ئەمە ڕاستە! تۆ بینیت چۆن نیشانی خۆم نە پێکا و لە دەستم چوو، ئەمە کەمێک هەڵەی تۆ بوو، تۆ دەزانی، بەڵام من لەسەرتی حسێب ناکەم.

ئۆرست: من چیم کردووە؟

ئێلکتر: تۆ فریوت دام (بەرەو لای ئەو دادەبەزێ) لێم گەڕێ با تەماشای سیمات بکەم. بەڵێ من گیرۆدەی چاوەکانی تۆم.

ئۆرست: زەمەن گوشار دەهێنێ، ئێلکتر گوێبگرە: با پێکەوە ڕابکەین کەسێک دەبێ ئەسپەکانم بۆ ئامادە بکات، لەپێشەوەی خۆم سوارت دەکەم.

ئێلکتر: نەخێر.

ئۆرست: تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا ڕابکەی؟

ئێلکتر: من نامەوێ ڕابکەم.

ئۆرست: دەتگەیەنمە کۆرینتا.

ئێلکتر: بەپێکەنینێکەوە.

هێ! کۆرینتا... تۆ دەبینی، تۆ بە ئەنقەست واناکەیت، بەڵام تۆ هەمدیسان من بەهەڵەدا دەبەیت. من لە کۆرینتا چ بکەم؟ دەبێ ئاقلانە بیربکەمەوە. دوێنێ هێشتا حەزی ئەو هێندە متەوازعانەم هەبوون: وەختایەک لەسەر مێزی نانخواردن، خواردن دابەش دەکەم، بەبرژانگی نزمەوە، لەنێو برژانگەکانم دەنۆڕمە خێزانی پادشایی، بێوەژنی جوان بەسیمای مردووەوە و ئەویش قەڵەو و ڕەنگ زەرد، بەدەمێکی سست و بەڕیشێکی ڕەش کە لەو گوێچکەیەوە تا گوێچکەی دیکەی وەکو تەونی جاڵجاڵۆکە درێژ دەبێتەوە و من خەونم بەوە دەبینی. ڕۆژێک دوکەڵێک ببینم، کەمە دوکەڵێکی چکۆڵانە و ڕاست وەک لە هەناسەی سپێدەیەکی سارد لە سکە هەڵدراوەکانیانەوە بەرزبێتەوە. سوێندت بۆ دەخۆم فیلیب ئەمە هەموو داوای من بوو. من نازانم تۆ چیت دەوێ، بەڵام نابێ باوەڕت پێبکەم: چاوەکانت متەوازع نین. دەزانی پێش ئەوەی تۆ بناسم بیرم لە چی دەکردەوە؟ ئەوەی ژیر نابێ لەسەر زەوی هەرگیز هیچ بخوازێ، ئەگەر نا، ڕۆژێک ئازار بەوانە دەگەیەنێ کە ئازاریان پێداوە.

ئۆرست: ئێلکتر، ئەگەر تۆ شوێنم بکەوی، دەبینی کە دەتوانین هێشتا زۆر شتی دیکەش بخوازین بێ ئەوەی ژیریش لەدەستبدەین.



ئێلکتر: نامەوێ چیتر گوێت لێبگرم؛ تۆ زۆر ئازارت دام. تۆ بە خۆت و چاوە برسییەکانتەوە و لە سیما کچانییەکەتەوە وات لێکردم ڕقەکەم لە بیر بکەم؛ دەستەکانم دەکەمەوە و ڕێگە دەدەم تاکە گەنجینەکەم بەسەر پێیەکانمدا بخزێ. خۆم بەوە ڕازی کرد کە دەتوانم لێرە خەڵکی بە وشەکانم چاک بکەمەوە. بینیت چی ڕوویدا: ئەوان ئازارەکانیان خۆشدەوێ، ئەوان پێویستیان بە برینێکی هۆگر هەیە کە بەوردی چاوەدێری بن، بە نینۆکە پیسەکانیان بیخورێنن. ئەوە دەبێ بەزەبروزەنگ چارەسەر بکرێن، چونکە ناتوانرێ بە سەر خراپەیەکەوە زاڵ ببی، تەنها بەخراپەیەکی دیکە نەبێ.

ماڵئاوا فیلیب، تۆ بڕۆ لێم گەڕێ بۆ خەونەکانم.

ئۆرست: دەتکوژن.

ئێلکتر: پەرستگەیەک لێرە هەیە، پەرستگەی ئەپۆلۆن؛ زۆر جار تاوانکارەکان پەنای بۆ دەبەن و، هەتاوەکو لەوێشدا بمێننەوە کەسێک ناتوانێ دەست لە تاڵە موویەکی سەریشیان بدات. لەوێدا خۆم دەشارمەوە.

ئۆرست: بۆچی یارمەتی من ڕەتدەکەیتەوە؟

ئێلکتر: ئەوە تۆ نیت کە یارمەتی من دەدەی. یەکێکی دیکە دێت من ڕزگار دەکات (ساتێک). دەزانم براکەم نەمردووە و، من چاوەڕوانی ئەو دەکەم.

ئۆرست: ئەگەر نەهات؟

ئێلکتر: ئەو دێت، ناکرێ نەیەت. لە ڕەگەزی خۆمانە، تێگەیشتی، وەکو من تاوان و بەدبەختی لەناو خوێنیدا هەیە. ئەفسەرێکی گەورەیە بەو چاوە سوورە گەورەکانیەوە وەکو چاوی باوکمانە، هەمیشە پڕە لە تووڕەیی، ئازار دەچێژێ، ساتمە بە چارەنووسیەوە دەکات وەکو چۆن ئەسپی سک هەڵدڕاو قاچەکانی لە ڕیخۆڵەکانی دەئاڵاسکێ و ئێستە بزووتنەوەیەک کە بیکات دەبێ هەناوی دەربهێنێ. ئەو دێت

ئەم شــارە ڕایدەکـێشـێ، من دڵنیــام، چونکە لەم شــارەدا دەتوانێ گــەورەترین ئــازار بنێــتـــەوە، دەتوانێ زۆرترین ئــازار بەخــۆیەوە بگەیەنێ. ئەو دێت، نێـو چەوان شـۆڕ بووە، ئازاراوی و ســووتاوە. دەمـتـرسێنێ: هەمـوو شـەوێک لەخەودا دەیبـینم لە نەعـرەتەی وریا دەبمەوە. بەڵام مـن چاوەڕوانی دەکــەم و خــۆشم دەوێ. دەبێ لـێــرە بمێنمــەوە بۆ ئەوەی ڕێبــەری تووڕەییـیــەکــەی بکەم- چونکە من زیرەکم- بۆ ئەوەی پەنجە بۆ گوناهبـارەکان درێژ بکەم و پێی بڵـێم: «لێدە، ئۆرست، لێدە: ئا ئەوەتانەن!».

ئۆرست: ئەی ئەگەر وەک ئەوە نەبوو کە تۆ خەیاڵی دەکەی؟

ئێلکتر: دەتەوێ کوڕی ئاگامەمنوون، کلیتیمنستر چۆن بێ؟

ئۆرست: ئەگـەر لەم هەمـوو خوێنە شـەکـەت بووبێ، لە شـارێکی بەختـەوەر گەورە بووبێ؟

ئێلکتر: ئەو کاتە تف دەکەمە دەموچاوی و پێی دەڵێم: «سەگە، بڕۆ، بڕۆ لای ژنان، چونکە تۆ تەنهـا ژنێکی. بەڵام تۆ بەهەڵەداچوویت: تۆ کوڕەزاکەی ئاترێی، تۆ لەچارەنووسی ئاترید ڕزگارت نابێ.

تۆ شـەرمـەزاریت لا باشـترە لە تاوان، تۆ ئازادی. بەڵام چارەنووس لەناو پێـخـەفـەکـەت بەدواتدا دەگـەڕێ: لەپێـشـدا شـەرم دەتگرێ و پاشان تۆ تاوانێک دەکەی دوور لە ویستی خۆتەوە!

ئۆرست: ئێلکتر من ئۆرستم.

ئێلکتر، لەناو هاوارێکەوە.

درۆ دەکەی!

ئۆرست: بەگیانی ئاگامەمنوونی باوکم، سوێندت بۆ دەخۆم: من ئۆرستم.

(بێ دەنگیــیــەک) ئێ ئەوجـا؟ چاوەڕوانی چی دەکــەی تا تف لە ڕووم بکەی؟

ئێلکتـر: چۆن دەتوانم ئەوە بکەم؟ (ئێلکتر سـەیری دەکـات) ئەم تەوێڵـە جـوانە تەوێڵی براکـەمـە. ئەو چاوانەی دەبریسکێنەوە چاوەکـانی



ئۆرستی براکەمن... ئاه! حەزم دەکرد تۆ فیلیب بوویتـایە و براکەم بمردبوایە (بەشەرمێکەوە) بەڕاستی تۆ لە کۆرینتا ژیاویت؟

ئۆرست: نەخێر بۆرژوایەکانی ئاتینا منیان بەخێو کرد.

ئێلکتـر: چەند گــەنج دیاری. ئایا تـۆ هەرگـیــز جـەنگت کــردووە؟ ئەو شمشێرەی بەپشتەوەیە هیچ کات بەکارت هێناوە؟

ئۆرست: هەرگیز.

ئێلکتر: کاتێک تۆم نەدەناسی کەمتر هەستم بە تەنیایی خۆم دەکرد: من چاوەڕوانی یەکـێکی دیکە بووم. تەنهـا بیـرم لە هێـزەکـەی دەکردەوە و هەرگیز بیرم لە لاوازی خۆم نەدەکردەوە. بەڵام ئێستە ئا ئەوەتا تۆ ئۆرست، ئەوە تۆ بووی. تەمـاشـای تۆ دەکـەم دەبینم کـە ئێـمـە دوو هەتیـوین (سـاتێک)، بەڵام خـۆشم دەوێی، تۆ دەزانی. زێتر لەوەی کە ئەوم خۆش دەویست.

ئۆرست: وەرە ئەگەر منت خۆشدەوێ با بەیەکەوە ڕابکەین.

ئێلکتر: ڕاکردن؟ لەگەڵ تۆ؟ نەخێر. ئەوە لێرەیە کە چارەنووسی ئاتریدەکان بڕیار دەدرێ و منیش ئاتریدێکم. من داوای هیچێکت لێ ناکەم. نامــەوێ هیچ شــتی تر لە فــیلیب داوا بکەم. بەڵام من لێــرە دەمێنمەوە.

ژووپیـتـێـر لە قـووڵایی شانۆکەوە وەدیاردەکەوێ و خۆی دەشارێتـەوە تا گوێیان لێ بگرێت.

ئۆرست: ئێلکـتـر، من ئۆرسـتـم... براکـەتم. منیش ئاتریدێکم، شـوێنی تۆ بەتەک منەوەیە.

ئێلکتـر: نەخـێـر، تۆ برای من نیت و ناتناسم. ئۆرست مـردووە، بۆ ئەو چاکـترە، لەمەودوا گـیـانی لەگەڵ گـیـانی باوکم و خوشکەکەم ڕێز دەگرم. بەڵام تۆ، کە هاتووی ناوی ئاتریدت بۆ خۆت هەڵگرتووە، تۆ کێی تا بڵێی لە ئێمە بیت؟ ئایا تۆ ژیانت لە سێبەری بکوژێک بەســەر بردووە؟ تۆ دەبێ منداڵێکی ئارام بووبی، ناسکی ئاغر،

شکۆی ئەو باوکەی بە خۆیەوەی گرتی، منداڵێکی تەواو پاک و خاوێن، چاوی پڕ لە بریسکەی باوەڕ بەخۆبوون بێ. تۆ باوەڕت بە خەڵک هەیە، چونکە زەردەخەنەی فرەت بۆ دەکەن، لەسەر مێزەکان، لەناو جێگە، لە هەنگاونانی سەر پەیژەکان، چونکە ئەمانە خزمەتکاری بەوەفای مرۆڤن لە ژیان، چونکە تۆ دەوڵەمەند بووی و زۆر بووکۆکەت هەبوون. تۆ دەبێ بیر لەوە بکەیتەوە کە بڕێک جار جیهان؛ ئەو هێندە خراپ نییە و لەزەتە؛ لێبگەڕێی وەک چۆن دەچیتە ناو گەرماوێکی زۆر شڵەتێن، بە هەناسەدانەوەی شادی. من لە شەش ساڵییەوە خزمەتکار بووم و سڵم لە هەموو شتێک دەکردەوە (ساتێک) بڕۆ گیانی جوان... چی لەگیانی جوان بکەم: ئەوەی منیش دەمەوێ بەشدارە لە تاوان.

ئۆرست: تۆ پێت وایە من تۆ تەنیا جێدەهێڵم؟ تۆ چی دەکەی لێرە، هەتاوەکو دوا هیواشت لەدەست دا.

ئێلکتر: ئەوە کاری منە.. ماڵئاوا، فیلیب.

ئۆرست: تۆ هەیدێم لێدەکەی؟ (چەند هەنگاوێک دەنێ و دەوەستێ) ئەو سوار چاکەی تۆ چاوەڕوانت دەکرد، ئەوە گوناهی منە ئەگەر من بەو نەچم؟ دەستەکانت دەگرت و پێت دەوت: «لێدە!» بەڵام تۆ هیچ شتێکت لە من داوا نەکرد. کەوایە من کێم.. خودای چاک، هەتا خوشکەکەی خۆیشم لە خۆیم دەکاتەوە، بێ ئەوەی تاقیشم بکاتەوە؟

ئێلکتر: ئاه! فیلیب، من ناتوانم بەهیچ کلۆجێ قورسایی دڵە بێ قینەکەت هەڵبگرم.

ئۆرست: (سەری لێشێواوە) ڕاستت وت. بێ قین، هەروا بێ خۆشەویستیش. تۆ، دەمتوانی خۆشم بوێی، دەمتوانی... بەڵام چی! بۆ خۆشەویستی، بۆ ڕق، پێویستە ئینسان خۆی بەخشندە بێ. جوانە، مرۆ بە خوێنی دەوڵەمەندەوە سەقامگیر لە نێوەڕاستی سەروەت و سامانەکانی، کە ڕۆژێکیان خۆی دەبەخشێ بە



خۆشەویستی، بۆ ڕق، لەگەلیشیەوە زەوییەکەی، ماڵەکەی و بیرەوەرییەکانی خۆی دەبەخشێ. من کێم و چیم هەیە بیبەخشم؟ من بەئاستەم بوونم هەیە، لەنێوان هەموو ئەو تارماییانەی ئەمڕۆ بەناو شاردا دەسووڕێنەوە، هیچیان لە من تارمایی تر نین، خۆشەویستی تارمایی، دوودڵ و پەرتوبڵاو وەک پاپۆڕە هەڵمینەکان، بەڵام من ناشارەزام بە حەزە قورسەکانی زیندووەکان (ساتێک). چ شەرمەزارییەکە! گەڕامەوە زێدەکەی خۆم، خوشکەکەم ڕەتی کردەوە دانم پیدا بنێت. ئێستە بۆ کوێ بچم؟ لە چ شارێک بگیرسێمەوە؟

ئێلکتر: شارێک نییە کچێک تێیدا بەسیمای جوانەوە چاوەڕوانت بکات؟

ئۆرست: کەس چاوەڕوانی من ناکات، لەم شار بۆ ئەم شار دەچم. بێگانە بەخەڵک و بەخودی خۆشم، شارەکان وەکو ئاوێکی هێمن بەدوای منەوە دادەخرێن. ئەگەر ئارگۆس جێبهێڵم چی دەمینێتەوە لە شوێن سەفەری من جگە لە بێ هیوایەکی تاڵ لە ناو دڵی تۆوە.

ئێلکتر: تۆ باسی چەند شاری بەختەوەرت بۆم کرد......

ئۆرست: من تەواو خولیای شادمانیم. من بیرەوەرییەکانی خۆمم دەوێ، خاکەکەم، شوێنەکەم لە ناو پیاوانی ئارگۆس (ساتێک) ئێلکتر من لێرە ناڕۆم.

ئێلکتر: فیلیب، بڕۆ لێت دەپاڕێمەوە. من دڵم پێت دەسووتێ، بڕۆ ئەگەر من لای تۆ خۆشەویستم، جگە لە خراپە هیچی ترت بۆ نایە، پاکییەکەت پڕۆژەکانم تێکدەدات.

ئۆرست: ناڕۆم.

ئێلکتر: ئێ تۆ لەو باوەڕدای من لێرە بەجێتبهێڵم، لەناو پاکییە جاڕسەکەت، حوکمێکی ترسناک و لاڵ بەسەر کارەکانمەوە؟
تۆ بۆچی کەللەڕەقی دەکەیت؟ کەسێک لێرە تۆی ناوێ.

ئۆرست: ئەمە تاقە شانسی منە ئێلکتر ناتوانی لێم ڕەتبکەیتەوە. لێم

تێبگە: دەمەوێ ببمە پیاوێکی سەر بەشوێنێک، پیاوێک لەنێوان پیاوان. بنۆڕە، کۆیلەیەک وەختایەک شەکەت و نێو چەوان تووڕە دەڕوات و بارێکی قورسی هەڵگرتووە، قاچ دەکێشێ و دەنۆڕێتە پێیەکانی، تەواو بۆ پێیەکانی، بۆ ئەوەی نەیەڵێ بکەوێ، ئەو لە شارەکەی خۆیەتی وەکو گەڵایەک وایە لەناو کۆمەڵە گەڵایەک، وەکو درەختێک وایە لەناو دارستان، ئارگۆس و دەوروبەری بەهەموو قورسایی و گەرمایی خۆیەوە، تەواو پڕ بەخودی خۆیەوە: من دەمەوێ ئەو کۆیلەیە بم، ئێلکترا من دەمەوێ شارەکە بەدەوری خۆمەوە کۆبکەمەوە و وەکو ڕووپۆشێک خۆمی تێدا لوول بدەم، وازی لێ ناهێنم.

ئێلکترا: سەد ساڵیش لەنێوان ئێمە بەسەر ببەیت، تۆ هەر تەنها بێگانەیەکی، تەنیاتر لە تەنیاییێک لەسەر ڕێگەیەکی گەورە. خەڵکی بە تیەچاوێکەوە لەکەلاوڕۆژنەی برژانگە نیمچە داخراوەکانیانەوە تێت دەڕوانن و، وەختایەکیش بەنزیکتدا ڕەتدەبن دەنگیان نزم دەکەنەوە.

ئۆرست: تۆ بڵێی ئاوەها ئاستەم بێ خزمەتی ئێوە بکەم؟ دەستەکانم دەتوانن بەرگری لە شارەکە بکەن و بایی ئارامکردنەوەی کڵۆڵییەکانتان زێڕم هەیە.

ئێلکترا: ئێمە نە کاپیتان و نەگیانی باوەڕدارمان کەم نییە تا چاکە بکات.

ئۆرست: ئەوجا...

چەند هەنگاوێک هەڵدەنێ، سەری نزم کردووە، ژووپیتێر بەدەست لێک سووینەوە بەدیار دەکەوێ.

ئۆرست: بەسەر بەرزکردنەوە: ئەگەر هەر هیچ نەبوایە بە ڕوونی بمبینیبایە، ئاه! زویس، زویس هۆ پاشای ئاسمان، من بەدەگمەن ڕووم لە تۆ ناوە و تۆش بەدەگمەن بەفریای من کەوتیت، بەڵام تۆ شایەد بە؛ من هەمیشە چاکەم ویستووە. ئێستە من هیلاکم، چیتر چاکە و خراپە



لە یەک جیا ناکەمەوە و پێویستم بەوەیە ڕێگەم بۆ نیشانبدەن. زویس تۆ بڵێی بەراستی هەق بێ کوڕە پادشایەک، کە لە زێدی خۆی ڕاونرابێ، دەستەمۆ بێ لە دووره وڵات بۆش و سەرشۆڕ بێ وەک سەگی هەیدێ لێکراو؟ ئایا ئەمە ویستی خۆتە؟ ناتوانم باوەڕ بکەم. وێڕای ئەوەش... هەڵبەت تۆ ڕێگەت لە خوێنڕشتن گرت... ئاه! کێ باسی خوێنڕشتن دەکات، ئیتر نازانم چی دەڵێم.. زویس لێت دەپاڕێمەوە: ئەگەر خۆ وەدەستدان و سووکایەتی ئەو یاسایانەن کە تۆ بەسەر منیان دەسەپێنی، بە ویستی خۆتەوە بەهێمایەک بۆم وەدیار بخە، چونکە هیچی دیکە بەرۆشنی شتەکە نابینم.

ژووپیتێر، لەگەڵ خودی خۆیەوە.

بەڵام کە وایە چۆن: لەخزمەتی تۆ دایە! ئەبراکاس، ئەبراکاس، تسێ- تسێ!

ڕووناکییەکە بەدەوری بەردەکە هەڵدەگیرسێ.

ئێلکترا، دەداتە قاقای پێکەنین.

ها، هە! ئەمڕۆ پەرجوو دەبارێ! بنۆڕە فلیبی لەخواترس، بنۆڕە چ قازانج دەکرێ لە ڕاوێژپێکردنی خوایەکانەوە! (پێکەنینێکی شێتانە دەیگرێ). کوڕە گەنج... فیلیبی لەخواترس: «زویس هێمایەکم بۆ بکە، هێمایەکم بۆ بکە!». ئا ئەوەتانێ ڕووناکییەکە بە دەوری بەردە پیرۆزەکەوەیە. بڕۆ! بۆ کۆرینتا! بۆ کۆرینتا! بڕۆ!

ئۆرست، بەڕوانینە بەردەکەوە:

کەوایە... ئەمەیان چاکە؟ (ساتێک، هەمیشە سەیری بەردەکە دەکات).

لەترسان خۆی کێشایەوە، تەواو نەرم. هەمیشە بڵێ «ببوورە» و «سوپاس». ئەمە ئاوەهایە؟ (ساتێک، هەمیشە سەیری بەردەکە دەکات) چاکە. چاکە یان...... (ساتێک) ئێلکترا!

ئێلکترا: بڕۆ خێراکە، بڕۆ خێراکە. ئەم دایەنە ژیرە بێ هیوا مەکە کە لە

بەرزایی ئۆلیمپیەوە خۆی بەسەر تۆ دەچەمێنێتەوە. (ڕادەوەستێ، حەپەساوە).

چیتە؟

ئۆرست، بە دەنگێکی گۆڕاوەوە. ڕێگەیەکی دیکە هەیە.

ئێلکتر: (تۆقیوە)

بەدکاری مەکە، فیلیب تۆ داوای یاسای خوایەکانت کردووە: ئێ جا ئەوە! تۆ خۆت دەیانزانی.

ئۆرست: یاسایەکان؟ ئاه؟ بەڵێ... تۆ دەتەوێ بڵێیی ڕووناکی لێرەوەیە، بەدەوری ئەم بەردە گەورەیەوە؟ ئەم ڕووناکییە بۆ من نییە و کەسیش چیتر لە ئێستە بەدواوە ناتوانێ فەرمانم لەسەر بکات.

ئێلکتر: تۆ بە مەتەڵ قسان دەکەیت.

ئۆرست: تۆ چەندە لە منەوە دووریت، لە ناکاوێکدا...... وەک ئەوەی هەموو شتێک گۆڕابێ! لە دەوروبەری منەوە شتێک هەبوو زیندوو و گەرم. شتێک کە تاوێک بەر لە ئێستە مرد. چۆن هەمووی بۆشە... ئاه! چ بۆشاییەکی فرە گەورەیە، تا دوورایی بینین...... (چەند هەنگاوێک دەنێ). شەو ڕادەکشێ... تۆ هەست ناکەی کە هەواکەی ساردە؟... کەوایە ئەمە چییە... ئەوە چییە کە تاوێک بەر لە ئێستە مرد؟

ئێلکتر: فیلیب...

ئۆرست: پێم وتی ڕێگەیەکی دیکە هەیە...، ڕێگەی من. تۆ نایبینی؟ لێرەوە دەردەچێ و بەرەو شار دادەبەزێ. دەبێ دابەزێ، تۆ حاڵی بوویت؛ تا لای ئێوە دادەبەزێ، ئێوە لەبنەبانی چاڵەکەوەن... تەواو لە قووڵایی... (ئۆرست بەرەو ئێلکتر دەچێتە پێشەوە). تۆ خوشکمی، ئێلکتر، ئەم شارەش شاری منە. خوشکەکەم. دەستی ئێلکتر دەگرێ.

ئێلکتر: لێم گەڕێ! تۆ ئازارم دەدەیت، تۆ دەمترسێنی و، من هی تۆ - نیم.



ئۆرست: دەزانم تۆ هێشتا کە هی من نییت: من زۆر سووکم، دەبێ بە کردەیەکی تەواو قورسەوە خۆم قورس بکەم، کە وام لێبکات لە هەوەسان تا قووڵایی ئارگۆس بچم.

ئێلکتر: تۆ دەتەوێ چ بکەیت؟

ئۆرست: بوەستە. ڕێگەم بدە با ماڵئاوایی لەو سووکییە پیرۆزە بکەم کە هی منە. لێمگەڕێ با ماڵئاوایی لە گەنجیم بکەم. ئێوارانێک هەیە، ئێوارەکانی کۆرینتا یا ئەتینا، پڕ لە گۆرانی و بۆن کە هەرگیز چیتر هی من نین. هەروەها سپێدەکانی پڕ لە هیوا... کەوایە ماڵئاوا! (بەرەو لای ئێلکتر دەچێ). وەرە. ئێلکتر، بنۆڕە شارەکەمان. شارەکەمان لێرەوەیە، سوور لە ژێر خۆرەتاو پڕیە لە گیزەگیزی مرۆ و مێشەکان، لە بێهەستییەکی پاش نیوەڕۆی هاوین، لە هەموو دیوارەکانیەوە، لەهەموو سەربانەکانیەوە، لە هەموو دەرگە داخراوەکانیەوە لە خۆیم دوور دەخاتەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەم شارە بگیرێ، لەوەتەی یەکەم سپێدەیەوە من هەستی پێدەکەم. تۆش هەروا ئێلکتر، تۆش دەیگری، من ئێوە دەگرم.

دەبمە تەورێک و ئەم دیوارە سەرسەختانە دەکەم بە دووکوت، سکی ئەم ماڵە ئاغرانە هەڵدەدەڕم. بەزامە کراوەکانیانەوە بۆنی ئالیک و بخووری لێدێت؛ دەبم بە تەور وەکو تەورێک لەناو دڵی داربەڕوویێکەوە خۆم دەئاخنمە ناو دڵی ئەم شارەوە.

ئێلکتر: تۆ چەند گۆڕاویت: چاوەکانت چیتر نابریسکێنەوە، زەردهەڵگەڕاو و تار بوون، مەخابن! تۆ ئەو هێندە ناسکی، فیلیب ئەوەتانێ تۆ وەک ئەو کەسە دەدوێی کە لە خەوندا دەمبینی.

ئۆرست: گوێبگرە: هەموو ئەو خەڵکانەی کە لە ژوورە تاریکەکانیانەوە بە دەوروبەری مەرحوومە خۆشەویستەکانیانەوە دەلەرزن، وا دابنێ کەمن هەموو تاوانەکانیان دەخەمە سەرشانی خۆمەوە. وا دابنێ کە

من دەمهەوێ ناوی (دزی پەشیمانییەکان)م بە باڵادا ببڕێ و هەموو پەشیمانییەکانیان لەناو خۆمدا جێگیر بکەم: پەشیمانی ئەو ژنەی کە مێردەکەی فریو دا، ئەو بازرگانەی لێگەڕا دایکی بمرێ، ئەو سووخۆرەی کە قەرزارەکانی تا مردن هەڵپاچی؟ بڵێ، ئەم ڕۆژانە کە پەشیمانییەکان زێتر لە مێشەکانی ئارگۆس ئامشۆم دەکەن، بە هەموو پەشیمانییەکانی شارەکەوە، ئایا من مافی ئەوەم نییە لەگەڵ ئێوە نیشتەنی بم؟ ئایا من لە ماڵی خۆم نیم، لەنێوان دیوارە خوێناوییەکانتانەوە، وەکو ئەو کوشتکارەی بە بەربینە سوورەکەیەوە لە دوکانەکەی، لەنێو ئەو گۆلکە لەخوێن هەڵکێشراوانەی کە خەریکە کەوڵیان دەکات.

ئێلکترا: تۆ دەتەوێ بۆ ئێمە پەشیمانبیتەوە؟

ئۆرست: پەشیمانبوونەوە؟ من وتم کە پەشیمانییەکانی ئێوە لە ناوەوەی خۆمدا جێگیر دەکەم، بەڵام من نەموتووە کە ئەم باڵندە هاتوهاوار گۆیانە: لەوانەیە ملیان بچەمێنمەوە.

ئێلکترا: ئێ چۆن دەتوانی خراپییەکانی ئێمە هەڵبگری؟

ئۆرست: ئێوە تەنها داوای ئەوە دەکەن لێیانەوە ڕزگار بن، تەنها پاشا و پاشاژن بە زۆر لەناو دڵتاندا دەیانهێڵنەوە.

ئێلکترا: پاشا و پاشاژن... فیلیب!

ئۆرست: خوداوەندەکان شایەدیم بۆدەدەن کە من نەمدەویست خوێنیان بڕێژم.

(بێدەنگییەکی درێژ)

ئێلکترا: تۆ زۆر گەنجی، زۆر بێ هێزی.

ئۆرست: ئایا ئێستە تۆ پاشگەز دەبیتەوە؟ لەناو کۆشک بمشارەوە، ئەم ئێوارەیە، بمگەیەنە تا جێگە خەوتنی پادشایی و ئەوسا تۆ دەبینی ئەگەر من زۆر بێهێزبم.

ئێلکترا: ئۆرست!



ئۆرست: ئێلکترا! هەر بۆ یەکەم جار تۆ پێم بڵێ ئۆرست.

ئێلکترا: بەڵێ، ئەوە بەڕاستی تۆی، تۆ ئۆرستی. من تۆم نەدەناسیەوە، چونکە من ئەوەم لە تۆ چاوەڕوان نەدەکرد. بەڵام ئەم تامە تاڵە لەناو دەممدا، ئەم تامە (تا)دارە هەزاران جار لە خەونەکانمدا هەستم پێکردووە و دەیناسمەوە. کەوایە تۆ هاتیت ئۆرست، بڕیارەکەت داوە و، ئا ئەوەتا من، وەک لە خەونەکانمدا، لە ئاستانەی ڕووداوێکی چارەنەکردنیدام، من دەترسێم- هەروەک لەناو خەونەکانمدا.

هۆ ئەو ساتانەی کە چەندە چاوەڕوانم کرد، هێندەش لێیان ترساوم! ئێستەش، ساتەکان پێکەوە دەبەسترێن وەکو ئامێرێک، پێچکەی ئێمە هیچی تر وچانمان بۆ نەماوەتەوە تا ئەوەی هەردووکمان لەسەر پشت ڕاکەوین، بە دوو سیمای وەک دیوارێکی ڕووخاو. هەموو ئەم خوێنە! ئەوە تۆ کە دەیڕێژی، ئەوە تۆی، کە خاوەنی چاوانی ئەوها ناسکی. مەخابن!

من هەرگیز جارێکی دیکە ئەم ناسکییە نابینمەوە، هەرگیز فیلیب نابینمەوە. ئۆرست، تۆ براگەورە و کەسی گەورەی خێزانەکەمانی، بمخە ناو باوەشتەوە، بمپارێزە، چونکە ئێمە بەسەر ئازارێکی زۆر گەورەدا دەڕۆین.

ئۆرست دەیخاتە ناو باوەشیەوە. ژووپیتێر لەناو حەشارگەکەیەوە دەردەچێ و بەگورگەلۆقە دەڕوات.

(پەردە)

## تابلۆی دووەم

*له کۆشکەوه، هۆڵی عەرش، پەیکەرێکی ژووپیتێر، تۆقێنەر و خوێناوی. دەمەدەمی خۆرئاوابوون.*

### شانۆی یەکەم

یەکەم جار ئێلکتر دێته ناوه و هێما بۆ ئۆرست دەکات بێته ژوورەوه.

ئۆرست: ئەوا هاتن!

شمشێرەکە بەدەستەوه دەگرێ.

ئێلکتر: ئەوانه سەربازه ئێشکگرەکانن.

بەدوام بکەوه: ئێمه لێرەدا خۆمان دەشارینەوه.

(ئەوان خۆیان لەو دیو تەختی پاشا دەشارنەوه)

### شانۆی دووەم

هەمان (کەسه خۆشاردووەکان)، دوو سەرباز

سەربازی یەکەم: نازانم مێشەکان ئەمرۆ چییانه: وا شێتبوون.

سەربازی دووەم: ئەوان بۆنی مەرگیان کردووه و ئەوەش کەیفسازیان دەکات و من ناوێرم چیدیکه باوێشک بدەم لەترسی ئەوەی نەوەکا مێشەکان خۆیان بخزێننه ناو دەمی کراوەم و له قوولایی گەروومدا سوار سوارانێ بکەن.

(ئێلکتر ساتێک خۆی نیشاندەدات و خۆی دەشارێتەوه)، گوێبگره، شتێک تەقەی لێوه هات.

سەربازی یەکەم: ئەوه ئاگاممنوونه لەسەر تەختی پاشایی دادەنیشێ.

سەربازی دووەم: ئاوەها سمتە گەورەکانی تەقه له داری تەختەکەوه دەهێنن؟

مەحاڵه، هاورێ، مردوو قورس نین.



سەربازی یەکەم: ئەوه مردووه ڕەشورووتەکانن که قورساییان نییه. بەڵام ئەو پێش ئەوەی ببێته مردووی پادشایانه، پاشایێکی زۆر زرپ و زیندوو بوو که سەد و بیست و پێنج کیلۆی قورسایی بوو. ئەوه بێگومان دەگمەنه که له چەند نیوه کیلۆیەک هیچێکی دیکەی لێ نەماوەتەوه.

سەربازی دووەم: کەوا بوو... تۆ پێت وایه ئەو لێرەیه؟

سەربازی یەکەم: ئەی تۆ دەتەوێ ئەو له کوێ بێت؟ ئەگەر من پاشایەکی مردوو بوومایه، خودی خۆم، هەموو ساڵێک مۆڵەتێکی بیست و چوار سەعاتیم وەردەگرت، بەدڵنیاییەوه دەگەڕامەوه سەر تەختی پادشاییەکەم و تەواوی ڕۆژەکەم لەوێدا بەسەر دەبرد، بیرەوەرییه شیرینەکانی جارانم وەبیر خۆم دەهێنایەوه، بێ ئەوەی ئازاری کەسێک بدەم.

سەربازی دووەم: تۆ ئەمه دەڵێی چونکه تۆ زیندووی. بەڵام ئەگەر تۆش زیندوو نەبوویای، بەقەد خەڵکانی دیکه خەوشت دەبوو. (سەربازی یەکەم شەقازللەیەکی لێدەدات). ئای لەوه! ئای لەوه.

سەربازی یەکەم: ئەمه بۆ سایەی تۆ! چاو. له یەک جاردا حەوتم کوشتن، یەک گرۆشانه بەیەکەوه.

سەربازی دووەم: له مردووەکان؟

سەربازی یەکەم: نەخێر له مێشەکان. دەستەکانم پڕن له خوێن (به پانتۆڵەکەی خۆی خوێنەکه پاک دەکاتەوه). هەی مێشی گامێش.

سەربازی دووەم: ئەگەر خوداوەندەکان مێشی مردوویان دروست بکردبوایه. بنۆڕه هەموو ئەم مرۆ مردووانەی که لێرەن: وتەیەکیان له زار نایەته دەرەوه، خۆیان وا ڕێکدەخەن بۆ ئەوەی کەسێک ئازار نەدەن. مێشه مردووەکانیش هەمان شێوەن.

سەربازی یەکەم: بێدەنگ به، ئەگەر بیرم لەوه دەکردەوه که لێره مێشه فانتۆمییەکان لەو سەرەوەی پەیژەکەدان.

سەربازی دووەم: بۆچی نا ؟

سەربازی یەکەم: تۆ وەبیرت نایە؟ هەموو ڕۆژ ئەم ئاژەڵۆکانە بەملیۆنەها دەمرن. جا ئەگەر هەموو ئەوانەی کە لەوەتای هاوینی ڕابوردووەوە مردوون بەرەڵڵا بکرێن، ئەوا سێ سەد و شەست و پێنج مردوو بۆ هەر زیندوویەک بە دەوری ئێمەدا دەخولێنەوە. پەح! هەوا بە مێشەکان شیرین بووە، ئێمە مێشان دەخۆین، بەمێشانیش هەناسە دەدەین، وەک چراوگەیەکی لینج دەچنە ناو گەروو و هەناومانەوە.

کەوایە پێم بڵێ، لەوانەیە لەبەر ئەمە بێ کە ئەم ژوورە بۆنێکی ئاوەها تایبەتی لێوە دێت.

سەربازی دووەم: پەح، سالۆنێکی هەزار پێ چوارگۆشەیی وەک ئەمە، چەند مردوویەکی مرۆیی بەسە بۆ ئەوەی گەنیوی بکات. دەڵێن مردووەکانمان هەناسەیان بۆگەنە.

سەربازی یەکەم: کەوایە گوێبگرە! ئەو پیاوانەی ئەوێ... خوێنی یەکتر دەخۆنەوە.

سەربازی دووەم: پێم وتی شتێک هەیە: تەختەکە جیرەی لێوە دێت.

ئەوان لەو دیو تەختی پادشاوە لەدەستە ڕاستەوە دەبینرێن، ئۆرست و ئێلکتر لەدەستە چەپن بە بەردەم پەیژەکانی تەختەکەوە ڕەتدەبن و بەدەستەڕاستەوە خۆیان دەگەیەننە حەشارگەکانیانەوە و لەو دەمانەوە سەربازەکان لە دەستەچەپەوە دەردەچن.

سەربازی یەکەم: تۆ چاک دەبینی کە هیچ کەسێک نییە. ئەوە ئاگامەمنوونە وەک پێم وتی، ئاگامەمنوونی نەعلەتی! دەبێ لەسەر سەرینەکانی دابنیشێ: ڕاست هەروەک پیتی I – و تەماشامان دەکات: هیچێکی وای نییە پێیەوە خەریک بێ تەنها تەماشاکردنی ئێمە نەبێ.

سەربازی دووەم: بۆ ئێمە وا چاکترە ڕاوەستانەکانمان ڕاست بکەینەوە، گەرچی مێشەکان لووتمان بخۆن.



سەربازی یەکەم: زێتر حەزم دەکرد لە تیپی پاسەوانی بوومایە، خەریکی وازی و کات بەسەربردن بوومایە؛ لەوێ مردووەکان کە دەگەڕێنەوە هاوڕێن، ڕووتەڵەی سادەن وەکو ئێمە. بەڵام وەختایەک بیر لەوە دەکەمەوە کە پاشای خوالێخۆشبوو لێرەیە و دوگمە نوقسانەکانی ڤێستەکەم دەژمێرێ، هەست بە گەپسازی دەکەم ئەو دەمانەی کە ژەنەرال ڕیزمان دەکات.

ئێگست، کلیتیمنستر دێنە ژوورەوە و خزمەتکارەکان چرایان هەڵگرتووە.

ئێگست: لێمان گەڕێن بە تەنیا.

## شانۆی سێیەم

ئێگست، کلیتیمنستر، ئۆرست و ئێلکتر (شاردراوەن)

کلیتیمنستر: چیتانە؟

ئێگست: بینیت؟ ئەگەر زارەترۆقم نەکردبن، بەچاوترووکانێک خۆیان لە پەشیمانییەکانیان ڕزگار دەکەن.

کلیتیمنستر: تەنها ئەوەیان نیگەرانت دەکات؟ ئێوە هەمیشە دەزانن چۆن لەو کاتانەی بتانەوێ ئازایەتیان لێ جلەو بکەن.

ئێگست: لەوانەیە وا بێ. من تەنها لەم کۆمیدیایانە زۆر شارەزام (ماوەیەک): پەشیمانم کە ناچار بووم سزای ئێلکتر بدەم.

کلیتیمنستر: لەبەر ئەوەی چونکە لەمن بووە؟ دەستتان خۆش کە واتانکرد و من وا دەبینم هەموو ئەوانەی ئێوە دەیکەن چاکن.

ئێگست: ژنەکە، ئەوە لەبەر تۆ نییە کە من پەشیمانم.

کلیتیمنستر: ئەی کەوایە بۆچی؟ ئێوە ئێلکترتان خۆش ناوێ.

ئێگست: من هیلاکم. ئەوە پانزە ساڵە بە باڵی درێژەوە پەشیمانییەکانی هەموو گەل لە هەوادا دەگرم. ئەوە پانزە ساڵە من وەکو دێو و درنج خۆم دەپۆشم: هەموو ئەم جلوبەرگە ڕەشانە بە ڕەشبوونی گیانی من کۆتاییان هات.

کلیتیمنستر: گەورەم، من خودی خۆم......

ئێگست: من دەزانم ژنەکە، من دەزانم: تۆ لەبارەی پەشیمانییەکانی خۆتەوە دەمدوێنی کەوایە من حەزم لێیانە، ئەوانە بناخە بۆ ژیانی تۆ دادەنێن. من پەشیمان نیم، بەڵام کەس لە ئارگۆس ئەو هێندەی من دڵتەنگ نییە.

کلیتیمنستر: گەورەم پاشای بەڕێز......

کلیتیمنستر: خۆی لە ئێگست نزیک دەکاتەوە.

ئێگست: لێمگەڕێ، ژنی بەدئەخلاق. لەژێر چاوەکانیەوە شەرم ناتگرێ؟

کلیتیمنستر: لەژێر چاوەکانیەوە؟ کەوا بێ کێ تەماشامان دەکات؟

ئێگست: کەوابێ، پاشا، ئەم بەیانییە مردووەکانیان بەرەڵلا کرد.

کلیتیمنستر: گەورەم، داوێنگیرتان دەبم... مردووەکان لەژێر خاکەوەن و وا بە تاڵووکە جاڕسمان ناکەن. ئایا ئەوەتان لەبیر چوو کە ئێوە خۆتان ئەم خورافیاتانەتان داهێناوە، بۆ گەل؟

ئێگست: تۆ ڕاست دەکەی، ژنەکە، کەوابێ تۆ دەبینی من چەندە هیلاکم؟ لێمگەڕێ، دەمەوێ خۆم کۆبکەمەوە.

(کلیتیمنستر: دەردەچێ)

## شانۆی چوارەم

ئێگست، ئۆرست و ئێلکتر (شاراوەن)

ئێگست: ئایا ئەمەیان ژووپیتێرە، ئەو پاشایەی کە تۆ پێویستت بوو بۆ ئارگۆس؟ دەچم، دێمەوە، دەزانم بە دەنگێکی بەهێز بقیژێنم، سیمای گەورەی تۆقێنەرم بۆ هەموو شوێنێک دەگێڕم و ئەوەی دەشمبینێ بۆ خۆی هەست بەوە دەکات کە تا سەر ئێسقان تاوانبارە. بەڵام من توێلکێکی بەتاڵم: گیلێک لە ناوەوەمدا منی خوارد بێ ئەوەی هەستی پێبکەم. ئێستەش دەنۆڕمە خودی- خۆم و



دەبینم من لە ئاگامەمنوون مردووترم. ئایا وتوومە من دڵتەنگم؟ درۆم کرد. بیابان ئەو عەدەمە بێ ئەژمارەی لمەکان لە ژێر عەدەمی زیوینی ئاسمان نە دڵتەنگە و نە دڵشادە، ئەو شوومە. ئاه! لە بەرامبەر ڕژتنی دڵۆپە فرمێسکێک مەملەکەتی خۆمی پێدەدەم.

ژووپیتێر دێتە ژوورەوە.

## شانۆی پێنجەم

هەمان کاراکتەرەکان، ژووپیتێر

ژووپیتێر: سکاڵای خۆت بکە: تۆش پادشایەکی وەک هەموو پادشایەکان.

ئێگست: تۆ کێی؟ هاتی بۆ ئێرە چی بکەی؟

ژووپیتێر: تۆ من ناناسیتەوە؟

ئێگست: لێرە بڕۆ، دەنا بە پاسەوانەکانم تێتهەڵدەدەم.

ژووپیتێر: تۆ من ناناسیتەوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا تۆ منت لە خەوندا بینیوە. ڕاستە زێتر شێوەیەکی ترسناکم هەبوو (هەورە برووسکە، تروسکاییەکان، ژووپیتێر شێوەیەکی ترسناک وەردەگرێ).

ئێدی ئا بەم شێوەیە؟

ئێگست: ژووپیتێر!

ژووپیتێر: ئاوا.. ئەوا یەکترمان ناسی (سیمای زەردەخەنە وەردەگرێ، لە پەیکەرەکە نزیک دەبێتەوە). ئەوەیان منم؟ ئاوەها خەڵکی ئارگۆس دەمبینن وەختایەک نوێژ دەکەن؟ بێگومان بە دەگمەن ڕێک دەکەوێ (خوداوەندێک) بتوانێ ڕووبەڕوو لە سیمای خۆی ڕابمێنێ (ساتێک).

ئای چەند ناشیرینم! وا پێناچێ ئەوان منیان زۆر خۆشبوێ.

ئێگست: ئەوان لێت دەترسن.

ژووپیتێر: دروست وایە! نامەوێ خۆشەویست بم، تۆ خۆت منت

خۆشدەوێ؟

ئێگست: چیتان لەمن دەوێ؟ هێشتا ئەوەندە نرخە بەس نییە کە داومە؟

ژووپیتێر: هەرگیز بەس نییە.

ئێگست: زێدەڕۆیی مەکە! تۆ ساغ و قەڵەویت. بەهەر جۆرێک بێ من لەسەر قەڵەوییەکەت لێتناگرم. ئەمە قەڵەوییەکی پادشایانەیە، زەردە، وەکو ڕۆنی گەنەگەرچەک، دەبێ ئاوەها بێت. تۆ هێشتاکە بۆ بیست ساڵەی دیکەی ژیان شایستەیت.

ئێگست: بیست ساڵی دیکەش!

ژووپیتێر: حەز دەکەی بمری؟

ئێگست: بەڵێ.

ژووپیتێر: ئەگەر کەسێک بە خۆیی و شمشێریکی ڕووتەوە بەو ناوەدا تێپەڕی، سینگت بۆ شمشێرەکەی دەکەیتەوە؟

ئێگست: نازانم.

ژووپیتێر: چاک گوێم لێبگرە ئەگەر لێدەگەڕێی وەکو گوێرەکە سەرت ببرن، ئەوا سزادانەکەت وەکو پەندی سەرزارانی لێدێت. تۆ بۆ هەمیشە دەبیتە پاشای دۆزەخ، من بۆ ئەوە هاتووم ئەوەت پێ بڵێم.

ئێگست: کەسێک هەیە بە دوای کوشتنمدا بگەڕێ؟

ژووپیتێر: وا پێدەچێ.

ئێگست: ئێلکتر؟

ژووپیتێر: یەکێکی دیکەش.

ئێگست: کێ؟

ژووپیتێر: ئۆرست.

ئێگست: ئاهـ (ساتێک) کەوایە ئەمە لە بەرنامەی چارەنووسە و من چیم پێدەکرێ؟

ژووپیتێر: «من چیم پێدەکرێ». (لەرەی دەنگی دەگۆڕێ). هەر ئێستە



فەرمان بدە کوڕە گەنجی بێگانە کە ناوی فیلیبە بیگرن، لەگەڵ ئێلکتر فڕێیان بدە ناو چاڵێکی قووڵەوە- ڕێگەت پێدەدەم لە بیریان بکەیت. کەوایە چاوەڕوانی چی دەکەی تۆ؟ بانگی پاسەوانەکانت بکە.

ئێگست: نەخێر.

ژووپیتێر: لە لوتفی خۆتەوە هۆیەکانی ڕەتکردنەوەکەتم پێ بڵێ؟

ئێگست: من هیلاکم.

ژووپیتێر: بۆچی دەڕوانیتە قاچەکانت؟ چاوە گەورە هێڵ هێڵە پڕ لە خوێنەکانت بەرەوڕووی من وەربگێڕە. ئاوەها! تۆ نەجیبزادە و بێ ئەقڵی وەکو ئەسپ. بەڵام بەرەنگاربوونەوەکەت لەو شێوەیە نییە ڕقم هەڵبسێنێ:

ئەوەیان ئەو بیبەرەیە کە دەمێکی دیکە هێشتا خۆبەدەستەوەدانەکەت بەتام و چێژتر دەکات. چونکە من دەزانم تۆ لە دواییدا چۆکی بۆ دادەدەیت.

ئێگست: پێم گوتن من نامەوێ بچمە ناو نەخشەکارییەکانی ئێوەوە، من زۆر جار ئەمەم کردووە.

ژووپیتێر: ئازایی! بەرگە بگرە! بەرگە بگرە! ئاهـ من چەندە تینووم بە گیانی کەسانی وەک تۆ. چاوەکانت بریسکەیان دێ، مشتەکانت دەگوشیت و ڕەتکردنەوەکەت بەڕووی ژووپیتێر دادەدەیتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەر بچووک، ئەسپی چکۆڵە، ئەسپە چکۆڵەی بەد، دەمێکە دڵەکەت بەمنی گوتووە بەڵێ فەرموون، تۆ گوێڕایەڵی دەکەیت. تۆ بڕوا دەکەی من بەبێ هۆ ئۆلیمپ Olympe جێبهێڵم؟ ویستم تۆ وریا بکەمەوە لەم تاوانە، چونکە پێم خۆشە ڕێگەی ئەم تاوانە بگرم.

ئێگست: تۆ من وریا دەکەیتەوە! ... بەڕاستی ئەمە زۆر سەیرە.

ژووپیتێر: بە پێچەوانەوە هیچ لەمە سروشتیتر نییە. دەمەوێ ئەم

مەترسییە لەسەری تۆوە وەرچەرخێنم.

ئێگست: کێ داوای ئەوەتان لێدەکات؟ ئەی ئاگامەمنوون ئەویشت وریا کردبۆوە؟ کەچی ئەو دەیەویست بژی.

ژووپیتێر: ئای لە سروشتی سپڵە، ئای لە ڕەوتاری نەگبەت: تۆ لای من لە ئاگامەمنوون خۆشەویستتری، من ئەوەت بۆ دەسەلمێنم و تۆش گلەیی دەکەیت.

ئێگست: لە ئاگامەمنوون خۆشەویستتر، من؟ ئەوە ئۆرستە کە لای تۆ خۆشەویستە. ئێوە ڕازی بوون کە من خۆم بفەوتێنم ئێوە منتان جێهێشت تا- تەور بەدەست- ڕاستەوڕاست بەرەو حەوزی گەرماوی پاشا بچم، ئەوەش بێگومان ئێوە لە سەرەوە لێوی خۆتان دەلستەوە، بیرتان لەوە دەکردەوە کە گیانی گوناهکار لەزەت بەخشە. بەڵام ئەمڕۆ ئێوە ئۆرست دەپارێزن دژ بە خودی- خۆی- من کە پاڵتان پێوە نام بۆ کوشتنی باوکی، ئێوە منتان بۆ باوەشی کوڕەکەی گلدایەوە. من تەواو ئامادەبووم بۆ ئەنجامدانی کوشتنێک. بەڵام ئەو، ببوورن، بێگومان، ئێوە ڕوانینێکی دیکەتان هەیە بۆ ئەو.

ژووپیتێر: چ ئیرەیییەکی سەیر و سەمەرەیە! دڵنیابە: لەتۆ زیاتر خۆشم ناوێ. من کەسم خۆشناوێ.

ئێگست: ئەی کەوایە، بزانە چیت بەمن کردووە، خودای بێداد. وەڵام بدەرەوە: ئەگەر ئەمڕۆ ڕێگە لەو تاوانە دەگریت کە ئۆرست دەیکات، کەوایە بۆچی ڕێگەت بە تاوانەکەی من دا؟

ژووپیتێر: هەڵبەت ناخۆشیم لە هەموو تاوانێک نابێتەوە، ئێگست، ئەوە با بەینی پاشایان بێ و، من بەڕاشکاوییەوە قسەتان لەگەڵ دەکەم: هەوەڵین تاوان، ئەوە من بەشداریم تێدا کرد کە پیاوکوژم دروستکردن. دوای ئەوە دەتوانن چی بکەن، ئێوە بکوژەکانی دیکە؟ مەرگ دەدەن بە قوربانییەکانتان؟ کەوایە بفەرموون، قوربانییەکانتان پێشتر مردنیان بەخۆیانەوە هەڵگرتووە. کارەکە



لەوەدایە ئێوە کەمێک بە تاڵووکەن بۆ وەگێرخستنی. تۆ دەزانی ئاگامەمنوون چی لێدەهات ئەگەر تۆ نەتکوشتبایە؟ سێ مانگ دواتر لەسەر سینگی کەنیزەکێکی جوان بە فێلێهاتن دەمرد. بەڵام تاوانەکەت بەقازانجی من بوو.

ئێگست: بە قازانچی تۆ بوو؟ ئەوە پانزە ساڵە من پەشیمانم و پەشیمانیم خزمەتی بەڕێزتان دەکات؟ ئای لەو بەدبەختییە.

ژووپیتێر: دەزانی مەسەلەکە چییە؟ چونکە تۆ لێی پەشیمانی ئەوە خزمەتی من دەکات.

من حەز لەم تاوانانە دەکەم کە نرخەکەی دەدرێ. من حەزم لە تاوانەکەی تۆ بوو، چونکە مردنێکی کەڕ و کوێرانە بوو، کەونارا، هەتاوەکو ناشارەزا بە خودی خۆشیەوە، زێتر لە بوومەلەرزەیەک دەچوو لەوەی کردەیەکی مرۆیی بێت. هەر بۆ چرکەیەکیش تۆ دژی ویستی من نەوەستایتەوە: تۆ لە هاژوهوژی تووڕەیی و ترسەوە لێتدا و پاشان کە (تا)یەکە داکەوتەوە، تۆ کردەکەی خۆت بە شەرەفمەندانە ڕاگرت و نەتویست دانی پێدا بنێی. لەگەڵ ئەوەش، چ دەسکەوتێکی مەزن بوو پێکات، بۆ یەک پیاوی مردوو بیست هەزاری دیکە لەناو پەشیمانیدا نوقم بوون، ئەمەش ئەنجامەکەیەتی. من سات و سەودایەکی دۆڕاوم نەکردووە.

ئێگست: دەبینم چی لەم دیو گوتارانە شاردراونەتەوە. ئۆرست پەشیمانی نازانێ.

ژووپیتێر: نەهیچ سێبەرێکی پەشیمانی. تا ئەو دەمانەش خەریکی پلان و میتۆدەکانی خۆیەتی بەکاوەخۆ، بەنەوازشەوە. چیم دەست دەکەوێ لە مەرگێکی بێ پەشیمانبوونەوە، لە مەرگێکی شەرمهێن، لە مەرگێکی لەسەرەخۆ، سووک وەک هەڵمی گیانی مردوویەک؟ ڕێگە لەمە دەگرم! ئاهـ! من ڕقم لە تاوانەکانی نەوەی نوێیە: تاوانی سپڵە و نەزۆکن وەکو خراپەکار. دوو پیاوی گەنج وەکو مریشک

سەرت دەبڕن و دەڕۆن، دەستەکان سوور و ویژدان پاک، من لە شوێنی تۆوە هەست بە شەرمەزاری دەکەم، بفەرموون! بانگی ئێشکچییەکان بکە.

ئێگست: من بە ئێوەم وت نا. ئەو تاوانانەی کە دەکرێن زۆر لات قێزەونن بۆ ئەوەی من بەدڵم نەبن.

ژووپیتێر: (لەرەی دەنگی دەگۆڕێ).

ئێگست، تۆ پاشایت، ئەوە بەویژدانی پاشایەکە کە قسەکانم ئاراستە دەکەم، چونکە تۆ حەز لە حوکمرانی دەکەیت.

ئێگست: ئیدی؟

ژووپیتێر: تۆ ڕقت لێم دەبێتەوە، بەڵام ئێمە خزمین، من لەسەر شێوەی خۆمەوە دروستم کردوویت: پاشا دەسەڵاتدارە لەسەر زەوی، بەگزادە و شوومە هەروەک پاشایەک.

ئێگست: شووم؟ ئێوە؟

ژووپیتێر: بنۆڕە من (بێدەنگییەکی درێژ) پێم گوتی کە تۆ لەسەر شێوەی من دروستکراویت. ئێمە هەردووکمان بۆ حوکمڕانی یاسا کاردەکەین، تۆ لە ئارگۆس و منیش لە جیهان و هەمان نهێنی بە قورسی خۆی دەخاتە سەر دڵمان.

ئێگست: من نهێنیم نییە.

ژووپیتێر: بەڵێ. هەمان نهێنی منە. نهێنی ئازاردانی پاشایەکان: ئەوەیە کە مرۆڤەکان ئازادن. ئێگست ئەوان ئازادن. تۆ دەیزانی بەڵام ئەوان نایزانن.

ئێگست: سوێند و قەسەم، ئەگەر بیزانن، ئاگر بەر دەدەنە هەر چوارگۆشەی کۆشکەکەم. ئەوە پانزە ساڵە من یاری کۆمیدییان بۆ دەکەم بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان لێ بشارمەوە.

ژووپیتێر: تۆ چاک دەبینی کە ئێمە هاویەکین.



ئێگست: هاویەک؟ بە چ شۆخییەکەوە پاشایەک خۆی بە من دەچوێنێ؟ لەوەتای من حوکمڕانی دەکەم، هەموو کردەوەکان و هەموو وتەکانم بۆ پێکهێنانی ئیماژی منن، دەمەوێ هەریەکە لە بندەستەکانم ئیماژی من لەناو خۆیدا هەڵبگرێ هەتاوەکو لە تەنیاییشیدا هەستی پێبکات. ڕوانینی دڵڕەقانەم خۆی بخاتە سەر بیرکردنەوەی لە هەمووان پەنهانیتری. بەڵام ئەوە منم کە یەکەمین قوربانی خۆمم: من چیتر خۆم وا نابینم وەک ئەوەی ئەوان دەمبینن، دەچەمێمەوە ناو بیری بۆشی گیانیان، ئیماژی من لەوێدایە تەواو لەناو ناخدا، نەفرەت و ئەفسوونم لێدەکەن.

پاشای هەموو دەسەڵاتێک من چیم، ئەگەر ئەو ترسە نەبم کە ئەوانی دیکە لێم بترسن.

ژووپیتێر: کەوایە تۆ باوەڕ دەکەی من کێم (هێما بۆ پەیکەرەکە دەکات) منیش هەروا ئیماژی خۆم هەیە. تۆ پێت وایە ئەم ئیماژە سەرەخولێم بۆ نایەنێ؟ لەوەتەی سەد هەزار ساڵەوە من لەبەرامبەر مرۆ سەما دەکەم. سەمایەکی تاریک و هێواش. دەبێ ئەوان لێم بنواڕن: چونکە چاویان بڕیوەتە سەر من، لەبیریان کردووە تەماشای خۆیان بکەن. ئەگەر یەک سات من خۆم لەبیر بکەم، ئەگەر لێبگەڕێم ڕوانینەکانیان وەرچەرخێنن......

ئێگست: ئیدی؟

ژووپیتێر: لێگەڕێ. ئەمە تەنها پێوەندی بەمنەوە هەیە. تۆ شەکەتی، ئێگست، بەڵام تۆ بەدەست چییەوە سکاڵاتە؟ تۆ دەمری من نا. تاوەکو مرۆ لەسەر ئەم زەوییە هەبن من ناچارم بەرامبەریان سەما بکەم.

ئێگست: مەخابن! بەڵام کێ ئێمەی ناچار کردووە؟

ژووپیتێر: هیچ کەسێک جگە لە ئێمە- خۆمان نەبێ، چونکە ئێمە هەمان خولیامان هەیە. ئێگست تۆ یاسات خۆشدەوێ.

ئێگست: یاسا، ئەمە ڕاستە. من بۆ یاسا عەودالّی کلیتیمنستر بووم، هەر بۆ یاساش بوو کە پاشایەکەم کوشت، من ویستم یاسا حوکمڕان بێ و لەڕێگەی منەوە حوکمڕانی بکات. من بەبێ حەز، بێ خۆشەویستی، بێ هیوا ژیام: یاسام داهێنا. ئۆی چ تۆقێنەر و چ سۆزێکی خوداییە!

ژووپیتێر: ئێمە ناتوانین جگە لە یاسا چیترمان هەبێ. من پاشام و، تۆش بۆ ئەوە لەدایک بوویت ببیت بە پاشا.

ئێگست: مەخابن!

ژووپیتێر: ئێگست، ئافەریدە و برای فانیم، بەناوی ئەم یاسایەی کە ئێمە خزمەتی دەکەین، داوات لێدەکەم: ئۆرست و خوشکەکەی بالّبەست بکە.

ئێگست: ئایا تا ئەو ڕادەیە ترسناکن؟

ژووپیتێر: ئۆرست دەزانێ کە ئەو ئازادە.

ئێگست: (بەگەرمییەوە) ئەو دەزانێ ئازادە، بەلاّم ئەوە بەس نییە کە تۆ ئاسنبەندی بکەیت.

پیاوێکی ئازاد لەناو شارێک، وەک بزنێکی گەڕ وایە کە لە مێگەلّ دابڕابێ.

ئەو؛ هەموو شانشینەکەم دەتەنێتەوە و کارەکانم وێران دەکات.

خودای گەورە، چی لێ چاوەڕوان دەکەی بۆ ئەوەی وێرانی بکات؟

ژووپیتێر-(بەهێمنییەوە) بۆ وێرانکردنی؟ (ساتێک. شەکەت و چەماوە).

ئێگست، پاشاکان نهێنییەکی دیکەیان هەیە......

ئێگست: دەتەوێ چیم پێ بلّێی؟

ژووپیتێر: وەختایەک یەکجار ئازادی لە ڕۆحی مرۆدا تەقیەوە، پاشاکان ناتوانن هیچێک دژ بەم مرۆڤە بکەن. چونکە ئەمە کاروباری مرۆییە و، هەروا هی مرۆیەکانی دیکەیە- هی ئەوانە و بەس- بۆ ئەوەی لێیگەڕێن ئازاد بێ یا بخنکێندرێ.



ئێگست: تێی دەڕوانێ.

بەخنکاندنی؟... ئەمە چاکە. بێگومان گوێڕایەلّت دەبم. بەلاّم هیچێکی زیادەی مەخە سەر و ماوەیەکی ئاوەها زۆر لێرە مەمێنەرەوە، چونکە من ناتوانم بەرگەی بگرم.

(ژووپیتێر دەردەچێ)

## شانۆی شەشەم

ئێگست تاوێک تەنیا دەمێنێتەوە، دواتر ئێلکتر و ئۆرست دێن.

ئێلکتر، (بەرەو دەرگە باز دەدات). بیکوتە! ماوەی مەدە هاوار بکات، من دەرگەکە دەگرم.

ئێگست: کەوایە ئەوە تۆی ئۆرست؟

ئۆرست: دەست بکەوە؟

ئێگست: دەست ناکەمەوە. ئێستە درەنگە بۆ ئەوەی بانگ هەلّبدەم و، من زۆر شادمانم کەوا درەنگ داهاتووە. بەلاّم من خۆم دەست ناکەمەوە: دەمەوێ تۆ من بکوژیت.

ئۆرست: زۆر چاکە. وەسیلەی کوشتنەکە لای من کەم بایەخی هەیە. کە وایە دەبمە بکوژت.

(بەشمشیرەکەیەوە لێیدەدات).

ئێگست، (بەلاربوونەوە) شمشێر وەشانەکەت هەلّەی نەکرد (خۆی بە ئۆرستەوە دەنووسێنێ) لێمگەڕێ با تەماشات بکەم. ڕاستە تۆ پەشیمان نیت؟

ئۆرست: پەشیمانی؟ بۆچی؟ ئەوەی من دەیکەم دادپەروەرییە.

ئێگست: دادپەروەری ئەوەیە کە ژووپیتێر دەیخوازێ. تۆ لێرەدا خۆت شاردبۆوە و تۆ گوێت لەقسان گرتبوو.

ئۆرست: من چ کارم بەسەر ژووپیتێرەوەیە؟ دادپەروەری مەسەلەیەکی

مرۆییه و پێویستم به هیچ خوداوەندێک نییه تا دەرسم بدات.
پیسی بۆگەن دادپەروەری ئەوەیە پانت بکەمەوە و ئیمپراتۆریاکەت لەسەر خەڵکی ئارگۆس وێران بکەم، دادپەروەری ئەوەیە هەستی کەرامەتی خۆیان بۆ بگێڕمەوە.

(پاڵی پێوە دەنێ).

ئێگست: هەست بە ئازار دەکەم.

ئێلکتر: بە لا دادێ و سیمای زەرد هەڵگەڕاوە، ئای لەم تۆقینە! مرۆ چەند ناشیرینە کە دەمرێ.

ئۆرست: بێدەنگ بە تا جگە لە شادی ئێمە هیچ بیرەوەرییەکی دیکە نەباتە ناو گۆڕەوە.

ئێگست: هەردووکتان نەفرەتتان لێبێت.

ئۆرست: تۆ بەمردن کۆتایی بەخۆت ناهێنی؟

(لێیدەدات، ئێگست بەردەبێتەوە).

ئێگست: وریای مێشەکان بە ئۆرست، وریای مێشەکان بە، هەموو شتێک کۆتایی پێنەهاتووە. (دەمرێ).

ئۆرست، (بەپێ پاڵی پێوە دەنێ). لە هەموو بارێکدا لای ئەو هەموو شتێک کۆتایی پێهات. ڕێبەریم بکە تا ژووری شاژن.

ئێلکتر: ئۆرست...

ئۆرست: ئیدی؟

ئێلکتر: شاژن چیدی ناتوانێ زیانمان لێبدات...

ئۆرست: ئێ ئەوجا؟ من تۆ ناناسمەوە بەر لە ئێستە تۆ بەم شێوەیە قسەت نەدەکرد.

ئێلکتر: ئۆرست... منیش هەروا تۆ ناناسمەوە.

ئۆرست: ئەمە چاکە، بە تەنیا دەردەچم.

(دەردەچێ).



## شانۆی حەوتەم

ئێلکتر، تەنیایە

ئێلکتر: تۆ بڵێی شاژن هاوار بکات؟ (ساتێک گوێی ڕادەدێرێ) ئۆرست بەناو دالانەکەدا دەڕوات. وەختایەک دەگاتە ئەوەی دەرگەی چوارەم دەکاتەوە... ئاه! ئەمە خواستم بووە! من ئەمەم دەوێ، دەبێ هێشتەش بمهەوێ. (تەماشای ئێگست دەکات). ئەوەیان مرد. کەوایە ئەوە بوو کە من دەمویست. من ئەوەم بەبیردا نەدەهات. (خۆی لێێ نزیک دەکاتەوە). سەد جار لە خەودا بینیومە، لەهەمان شوێندا ڕاکشابوو، شمشێرێک لەناو دڵییەوە. چاوەکانی داخراوبوون و وەک ئەوەی نووستوویێ. چەند ڕقم لێدەبۆوە، چەند دڵشادم بەرق لێبوونەوەی. ئەو وا پێناچێ نووستوویێ و چاوەکانی کراوەن، تێم دەڕوانێ. ئەو مردووە- و ڕقی من لەگەڵ ئەودا مرد. من ئا ئەوەتا لێرەم؛ چاوەڕوانم، ئەوی دیکە هێشتە لەناو قووڵایی ژوورەکەی هەر زیندووە و تاوێکی دیکە هاوار دەکات. وەکو چارەوێک هاوار دەکات. ئاه! ناتوانم چیتر بەرگەی ئەم ڕوانینە بگرم. (بەسەر چۆکدا دەکەوێ و پاڵتۆیەک دەخاتە سەر سیمای ئێگستەوە). (ئۆرست لێیدەدا)، ئەو دایکمان بوو و، (ئۆرست لێیدەدا، هەڵدەستێتەوە). ئەوەتا: دوژمنەکانم مردن.

ماوەی چەندین ساڵ من پێشوەختە بەم مەرگە خۆشنوود بووم و ئێستەش دڵەکەم لەناو مەنگەنە قەتیس بووە. تۆ بڵێی من ماوەی پانزە ساڵ درۆم لەگەڵ خۆم کردبێ؟ ئەمە ڕاست نییە! ئەمە نابێ ڕاست بێ: من ترسنۆک نیم! ئەو دەقیقەیەی بەر لەئێستە من ئەم کوشتنەم ویستووە و ئێستەش هەر دەمەوێ. حەزم کردووە ببینم ئەم بەرازە پیسە لەبەر پێیەکانم بکەوێ. (پاڵتۆکە لادەبات). چی بەلای منەوە گرینگە، ڕوانینەکانت کە لە ماسی مردوو دەچن. من

ئەم ڕوانینەم ویستووە و ئەمە کەیفسازم دەکات. (هاوارێکی زۆر هێمنتر لە کلیتیمنسترەوە). چ هاوارێک! چ هاوارێک! من هاوارە تۆقێنەرەکان و ئازارەکانی ئەوم دەوێ. (هاوارەکان دەوەستن) شادی! شادی! لەخۆشیانا دەگریم: دوژمنەکانم مردن و باوکم تۆڵەی سێنرایەوە.

(ئۆرست دێتە ژوورەوە، شمشێرێکی خوێناوی لەدەستە. ئێلکتر بەرەو لای ڕا دەکات)

## شانۆی هەشتەم

ئێلکتر، ئۆرست.

ئێلکتر: ئۆرست!

(ئێلکتر خۆی دەهاوێتە باوەشی ئۆرست).

ئۆرست: لە چی دەترسێی؟

ئێلکتر: ناترسێم، سەرخۆشم، سەرخۆش لەخۆشیانا. کلیتیمنستر چی وت؟ ئایا زۆر نووزایەوە بۆ ئەوەی لێی خۆشبی؟

ئۆرست: ئێلکتر من پەشیمانم لەوەی کردم، بەڵام پێم باش نییە لەسەری بدوێین: چەند بیرەوەرییەک هەن کە هاوبەش نین. تەنها ئەوە بزانە کە کلیتیمنستر مرد.

ئێلکتر: بە نەفرەت لە ئێمەکردنەوە مرد؟ تەنها ئەوەم پێ بڵێ: بە نەفرەت لە ئێمەکردنەوە مرد؟

ئۆرست: بەڵێ بە نەفرەت لە ئێمەکردنەوە.

ئێلکتر: بمخە باوەشتەوە خۆشەویستەکەم، بەهەموو هێزێکتەوە بمگوشە، وەک چۆن شەو تاریکتر دادێ و وەک چۆن تروسکەکانی ئەم مەشخەڵانە بە ئاستەم کونی دەکەن! تۆ منت خۆشدەوێ؟

ئۆرست: شەو بەسەر چوو: ئەوە دەستپێکی ڕۆژە، ئێمە ئازادین، ئێلکتر پێم وایە من وام کرد تۆ لەدایک ببیتەوە و منیش هەر ئێستە لەگەڵ



تۆ لەدایک بوومەوە، تۆ هی منی. خوێن بە دووسەرە پێکەوەمان دەبەستێتەوە، چونکە هەمان خوێنمان هەیە و خوێنیشمان ڕشتووە.

ئێلکتر: شمشێرەکەت فڕێدە ئەم دەستەتم بدەرێ (دەستی دەگرێ و ماچی دەکات). پەنجەکانت کورت و چوارگۆشەن. پەنجەکانت بۆ گرتن و سەندن کراون. دەستە خۆشەویستەکە! لەدەستی من سپیترە. چەند قورس دروستکراون بۆ لێدانی بکوژەکانی باوکمان! بوەستە (بەشوێن چراوگێک دەگەڕێ و لە ئۆرست نزیک دەکەوێتەوە). دەبێ سیمات ڕووناک بکەمەوە، چونکە تاریکی شەو دادەکشێ و من چیتر باش ناتبینم، من پێویستم بەوەیە سەیرت بکەم: وەختایەک چیتر ناتبینم، لێت دەترسم، نابێ چاوانم لە سەرت دابخەم. خۆشم دەوێی. دەبێ بیر لەوە بکەمەوە کە خۆشم دەوێی، چەندە سیمایەکی نامۆت هەیە.

ئۆرست: من ئازادم ئێلکتر، ئازادی وەکو هەورەتریشقە بەناو مندا ڕۆچووە.

ئێلکتر: ئازاد؟ من هەست ناکەم ئازادم. تۆ دەتوانی خۆت وا لێبکەی کە ئەم شتانە ڕوویان نەدابێ؟ چەند شتێک هاتۆتە پێشەوە و ئێمە چیتر ئازاد نین ئەگەر بیگۆڕین. تۆ دەتوانی ڕێگە لەوە بگری کە ئێمە بۆ هەمیشە بکوژی دایکمانین؟

ئۆرست: بڕوا دەکەی کە من دەمەوێ ڕێگە لەوە بگرم؟ ئێلکتر من کاری خۆم کرد و ئەم کارە باش بوو. من خستمە سەرشانی خۆم وەک چۆن کەشتییەوانێک گەشتیارەکان دەپەڕێنێتەوە، من دەیانپەڕێنمەوە لای دیکەی کەنار و حسابی بۆ دەکەم. هەر چەندە قورستر بێ بۆ هەڵگرتن، هێندە زێتر کەیفسازم دەکات، چونکە ئەوە ئازادی منە، دوێنێ هێشتاکە لە خۆمەوە بەبێ هیچ نیازێک لەسەر زەوی دەڕۆیشتم و هەزاران ڕێگە لەژێر پێیەکانم ڕایاندەکرد.

چونکە ئەم ڕێگەیانە هی خەڵکانی دیکە بوون. من هەموویانم خواستەوە، ڕێگەی کەشتیوانەکان کە بە درێژەی کەناری زەریاوە

ڕادەکەن، تووڵەڕێگەی ئەسپەکان و ڕێگە بەردڕێژەکانی شوفێرەکانی
عەرەبانە؛ بەڵام ئەمانە هیچیان هی من نەبوون. ئەمڕۆ تەنها یەک
ڕێگەیان لێ ماوەتەوە و خوا دەزانێ بەرەو کوێ دەگات: بەڵام ئەوە
ڕێگەی منە. چیتە؟

ئێلکتر: ناتوانم بتبینم! ئەم چرایانە ڕووناکییان نییە، گوێم لە دەنگتە، بەڵام ئازارم دەدات، وەکو چەقۆ کوتم دەکات.

ئایا لەمەودوا هەمیشە هەروا تاریک دەمێنێتەوە، هەتا بەڕۆژیش؟

ئۆرست ئا ئەوەتانێ هاتن!

ئۆرست: کێ؟

ئێلکتر: ئا ئەوەتانێ! لە کوێوەوە دێن؟ وەکو هێشووی ترێی ڕەش بە بنمیچەکەوە شۆڕدەبنەوە و ئەوە ئەوانن کە دیوارەکان ڕەشهەڵدەگەڕێنن، لەنێوان ڕووناکییەکان و چاوەکانمدا هەڵدەخلیسکێن و سێبەرەکانیان ڕوخساری تۆم لێ دەشارنەوە.

ئۆرست: مێشەکان.

ئێلکتر: گوێبگرە: گوێ لە خشەی باڵەکانیان بگرە، لە گرمەی کوورەکەی ئاسن دەچن. ئاپۆرەمان دەدەن، ئۆرست. چاوەدێریمان دەکەن؛ تاوێکی دیکە هەڵدەکوتنە سەر ئێمە و وا هەستدەکەم هەزار پێیەک نووساوەتە سەر جەستەم. بۆ کوێ ڕابکەین. ئۆرست؟

ئەوانە دەپەنمێن، ئا ئەوەتانێن گەورەن بەقەد مێشەنگوینێک، لە هەموو شوێنێکەوە، وەکو ڕەشەبایەکی چڕ شوێنمان دەکەون، چ تۆقینێکە! چاوەکانیان دەبینم، ملوێنەها چاویان تێمان دەڕوانن.

ئۆرست: ئێمە چ کارمان بەسەر مێشەکانەوەیە؟

ئێلکتر: ئۆرست ئەوانە ئێرینییەکانن، شاژنە خودای پەشیمان بوونەوە.

(چەند دەنگێک لەو دیو دەرگەوە)

دەرگە بکەنەوە! دەرگە بکەنەوە! ئەگەر دەرگە نەکەنەوە، دەبێ



دەرگەکە بشکێندرێ.

(چەند تەقەیەکی بەهێز لەو دیو دەرگەوە)

ئۆرست: هاواری کلیتیمنستر پاسەوانەکانی بەکێش کردووە. وەرن بمبەن بۆ میحرابی ئەپۆلۆن؛ شەو لەوێدا لە نەوای مرۆکان و مێشەکانەوە بەسەر دەبەین. بەیانی بۆ گەلەکەم قسە دەکەم.

(پەردە)

## شانۆی یەکەم

*پەرستگەی ئەپۆلۆن. ڕووناکییەکی خامۆش. پەیکەرێکی ئەپۆلۆن لە ناوەڕاستی شانۆدا.*

*ئێلکترو ئۆرست لەژێر پێی پەیکەرەکەوە نووستوون، قاچەکانیان بەدەستەکانی خۆیان وەرئالاندووە. ئێرینییەکان لەسەر شێوەی بازنە، دەوران دەوریان داون؛ دەخەون، وەکو سەقاقووش هەڵدەستنەوە. لە قوولایی شانۆکەوە دەرگەیەکی زل و زەلامی لە برۆنز دروستکراو.*

ئێرینی یەکەم: ڕادەکشێ. هەها! بەڕاوەستاوەیی نووستووم، تەواو لە تووڕەییییان ڕاوەستاوم، خەونی فرەجاڕسم بینین. گوڵە جوانەکەی تووڕەیی، گوڵە سوورە جوانەکەی ناو دڵەکەم (بە دەوری ئۆرست و ئێلکتر دەخولێتەوە). ئەوانە نوستوون چەند سپین، چەندە ناسکن! وەک لێشاوی ناو بەردەڵان هەڵدەخزێمە سەر سک و سنگیانەوە. بەحەوسەڵەوە ئەم گۆشتە ناسکە دەبڕم، دەیخورێنم و پێستی دەگرم، تا سەر ئێسقان دەیسووم (چەند هەنگاوێک هەڵدەنێ). ئای لە سپێدەی تەواو لە ڕق! ئەم وریاییبیە چ شکۆمەندە:

خەوتوون، شێدارن، هەست بە (تا) دەکەن، منیش بێدارم، چالاک و سەخت، گیانم لە مسە هەستدەکەم پیرۆز بوومە.

(ئێلکتر خەوتووە)

مەخابن!

ئێرینی یەکەم: ئەوەیان دەناڵێنێ، ئارام بگرە بەم زووانە گازەکانمان دەناسی، وات لێدەکەین لەژێر دەست پێداهێنانەکانماندا بقیژێنی. وەک چۆن نێرینە دەچێتە ناو مێیینە ئاوەها دێمە ناو تۆ، چونکە تۆ خێزانی منیت و تۆ هەست بەقورسایی خۆشەویستییەکەم دەکەیت.



ئێلکتر تۆ جوانی، لەمن جوانتر، بەڵام تۆ دەبینی کە ماچەکانم پیری دەهێنن، شەش مانگ تێپەڕ نابێ وەکو پیرەژنێک دەتشکێنم و خۆشم هەر گەنج دەمێنمەوە (خۆی بە سەریاندا دەچەمێنێتەوە). ئەوانە نێچیری قابیلی تێکشان و تام خۆشن؛ تێیان دەنۆڕم، بۆنی دەمیان دەکەم و تووڕەیی دەمخنکێنێ. ئای چەند بەلەزەتە سپێدەیەک هەست بە ڕق بکەیت. بەلەزەتە هەست بەچڕنووکەکان و کەڵبەکان بکەیت، لەگەڵ ئاگر لەناو دەمارەکان. تووڕەیی دامدەپۆشێ و دەمخنکێنێ، وەکو شیر بەناو مەمکەکانم هەڵدەکشێ. وریا ببنەوە خوشکەکانم، وریا ببنەوە: ئەوەتا سپێدەیە.

ئێرینی دووەم: خەون بەوە دەبینم کە گاز بگرم.

ئێرینی دووەم: حەوسەڵەت هەبێ: خوداوەندێک ئەمڕۆ دەیانپارێزی، بەڵام هاکا دیتت بەم زووانە تێنوێتی و برسێتی لەم نەوایە ڕاویان دەنێ. ئەو کات تۆ بەهەمموو ددانەکانتەوە گازیان لێبگرە.

ئێرینی سێیەم: هە ها! من دەمەوێ خامۆش بگرم.

ئێرینی یەکەم: کەمێک بوەستە: بەم زووانە نینۆکە ئاسنینەکانت هەزاران توولەڕێگەی سوور لەناو گۆشتی گوناهبارەکان هەڵدەکۆڵێ. خوشکەکانم، نیزیک ببنەوە، وەرن تەماشا کەن.

ئێرینی یەکەم: ئای چەند گەنجن!

ئێرینییەکی دیکە: ئای چەند جوانن!

ئێرینی یەکەم: خۆشی لەخۆتان: زۆربەی جار تاوانکارەکان پیر و ناشیرینن، ئەوە تەنها ڕێکەوتێکی زۆر دەگمەنە، شادی بواری بێ ئەوانە تێکبدات کە جوانن.

ئێرینییەکان: هەیها! هەیها!

ئێرینی سێیەم: ئۆرست دەق هەر وەک منداڵ وایە. ڕقی من بۆ ئەو وەک سۆزی دایکانە دەبێ. سەرە هەڵگەڕاوەکەی دەخەمە سەر ئەژنۆکانم،

دەست بە قژەکانی دادەهێنم.

ئێرینی یەکەم: ئێ ئەوجا؟

ئێرینی سێیەم: دوای ئەوە بە تاوێک ئا ئەم دوو پەنجانەم دەخەمە ناو چاوەکانیەوە

(هەموویان دەدەنە قاقای پێکەنین).

ئێرینی یەکەم: ئەوانە هەناسە دەدەن، خۆیان دەجوولێننەوە خوشکەکانم، خوشکە مێشەکانم، وەرن با بە گۆرانییەکانمان تاوانکارەکان لە خەو هەڵبسێنین.

کۆرسی ئێرینییەکان:

بزز، بزز، بزز، بزز
وەک چۆن مێش لەسەر شیرینی دەنیشێتەوە
ئێمە ئاوا دەگەینە سەر دڵە بۆگەنەکەت،
دڵی گەنیو، دڵی خوێناوی، دڵی بەلەزەت،
وەکو مێشەنگوین، کێم و زووخاوی دڵت
هەڵدەمژین.
هەنگوینی لێ دروست دەکەین، تۆ دەبینی،
هەنگوینێکی چاکی سەوز،
چ خۆشەویستییەک وەکو ڕق پڕمان دەکاتەوە؟
بزز، بزز، بزز، بزز
دەبینە چاوی جێگری ماڵەکان
وەک گرموهۆڕی سەگی پاسەوان کە ددانەکانی بەسەر
ڕۆیشتنی تۆوە نیشاندەدات.
ئەو گزە گزەی کە بەسەر سەرتەوەیە
بەسەر ئاسمان دەشکێتەوە
هاتوهەرای دارستانەکە،



فیکەکان، تەقەتەقەکان، زیکە زیکەکان،
دەنگی باڵندەکان لە شەو
دەبین بە شەو
شەوی تاری گیانی تۆ
بزز، بزز، بزز، بزز
هیەها! هیەها! هیەها!
بزز، بزز، بزز، بزز
ئێمەی مێش زووخاو دەمژین
هەمووی لەگەڵ تۆ بەش دەکەین،
لەناو دەمی تۆ، لە تیشکی
ڕووناکی قووڵایی چاوەکانتەوە بەدوای
خواردەمەنی دەگەڕێین.
تا گۆڕ هاوەڵێت دەکەن
شوێنمان جێ ناهێڵێن تەنها بۆ کرمەکان نەبێ.
بزز، بزز، بزز
سەما دەکەن

ئێلکتر (وریا دەبێتەوە): کێ قسە دەکات؟ ئێوە کێن؟

ئێرینییەکان: بزز، بزز، بزز

ئێلکتر: ئاه! ئا ئەوەتا کەوایە ئەوە ئێوەن؟ تۆ بڵێی ئێمە بەڕاستی کوشتوومانن؟

ئۆرست، (وریا دەبێتەوە): ئێلکتر!

ئێلکتر : ئەتۆ کێی؟ ئاه! تۆ ئۆرستی، برۆ.

ئۆرست: کەوابێ تۆ چیتە؟

ئێلکتر: تۆ دەمترسێنی من خەونم بەوە دەبینی کە دایکمان سەر ئاوەژوو بکەوتبایە و خوێنی لەبەر برۆیشتبایە و خوێنەکەی وەکو جۆگەلە

لەژێر هەموو دەرگایەکانی کۆشکەوە بڕۆیشتبایە. دەست بدە دەستەکانم، ساردن. لێم گەڕێ. دەستم لێ مەدە. ئایا زۆری خوێن لەبەر ڕۆیشت؟

ئۆرست: بێدەنگ بە.

ئێلکتر (بەتەواوی وریا دەبێتەوە): لێم گەڕێ تێت بڕوانم، تۆ کوشتیانت. تۆ بووی کە کوشتیانت. ئەوە تۆی لێرە، هاکا دەمێکە وریا بوویتەوە، هیچ شتێک لەسەر سیمات نەنووسراوە، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ کوشتیانت.

ئۆرست: ئێ ئەوجا؟ بەڵێ من کوشتیانم! (ساتێک). بێدەنگ بە، تۆ دەمترسێنی، تۆ دوێنێ ئەو هێندە جوان بوویت. دەڵێی دڕندەیەک بە چڕنووکەکانی دەموچاوی تێکداوی.

ئێلکتر: دڕندەیەک؟ تاوانەکەی تۆ گۆنا و برژانگەکانم دادەماڵێ؛ پێم وایە چاوەکانم و ددانەکانم ڕووتن. ئەوانەی ئێرە! ئەوانە کێن؟

ئۆرست: بیر لەوانە مەکەوە. ئەوانە ناتوانن هیچ شتێک دژی تۆ بکەن.

ئێرینی یەکەم: ئەگەر جورئەت دەکات با بێتە ناوەڕاستی ئێمە و ئەوجا تۆ دەبینی ئەگەر ئێمە نەتوانین هیچ شتێک دژ بە ئەو بکەین.

ئۆرست: هێمن بەوە دێڵە سەگ. بۆ کولانە! (ئێرینییەکان نەڕەنەڕ دەکەن).

ئەوەی دوێنێ لەناو ڕۆبێکی سپی لەسەر پەیژەکانی پەرستگەکەوە سەمای دەکرد، ناشێ ئەوە تۆ بووبیت؟

ئێلکتر: لە یەک شەودا پیربووم.

ئۆرست: تۆ هێشتە هەر جوانی، بەڵام..... کەوایە من لە کوێ ئەم چاوە مردووانەم بینیوە؟ ئێلکتر... تۆ لەم دەچی؛ تۆ لە کلیتیمنستر دەچی. تۆ بڵێی پێویست بوو بیکوژم؟ وەختایەک تاوانەکەی خۆم لەناو ئەم چاوانەدا دەبینم، زارەترۆقم دەکات.



ئێرینی یەکەم: ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئەو لە تۆ زارەترۆق بووە.

ئۆرست: جا ئەوە ڕاستە؟ ئایا ئەوە ڕاستە کە من تۆم زارەترۆق کردووە.

ئێلکتر: لێمگەڕێ.

ئێرینی یەکەم: ئێ جا ئەو هایە؟ تۆ بچووکترین گومانت ماوە؟ چۆن ئەو ڕقی لێتنابێتەوە؟ ئەو بە هێمنی لەگەڵ خەونەکانی خۆی دەژی، تۆ هاتی کوشتارگە و گڵاویت لەگەڵ خۆتدا هێنا. ئا ئەوەتا بەشداری هەڵەی تۆ دەکات، بەم بنکەی پەیکەرەوە نووساوە، تاکە پارچە زەوییەکە بۆ ئەو مابێتەوە.

ئۆرست: گوێی لێ مەگرە.

ئێرینی یەکەم: بۆ پاشەوە! بۆ پاشەوە! ئێلکتر هەیدێی لێ بکە، لێمەگەڕێ بەدەستەکانی دەستت لێ بدات. ئەو کوشتکارە! بۆنی خوێنی پەشیمانییەکی گرفتاری هەڵگرتووە. بەڕێگەیەکی ناشیرین پیرەژنی کوشت. تۆ دەزانی چەند جار گەڕایەوە سەری.

ئێلکتر: تۆ درۆ ناکەی؟

ئێرینی یەکەم: تۆ دەتوانی بڕوام پێبکەی، ئەوکاتە من لەوێ بووم، بەدەوری ئەوانەوە گزەگزم دەکرد.

ئێلکتر: ئایا چەند جار لێیدا؟

ئێرینی یەکەم: دوانزە جارێک لێیدا. هەر جارێکیش شمشێرەکە لەناو برینەکەوە تەقەی لێوە دەهات. بەدەستەکانیەوە سیما و سکی دەپاراست، دەستەکانی بڕین.

ئێلکتر: ئەو زۆر ئازاری هەبوو؟ ئایا دەمودەست نەمرد؟

ئۆرست: چیتر سەیریان مەکە، گوێچکەکانت بگرە، وای لە خۆت ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی، خۆت دەفەوتێنی ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت.

ئێرینی یەکەم: ئازارێکی تۆقێنەرانەی هەبوو.

ئێلکتر: (بەدەستەکانی سیمای خۆی دەشاردەوە): ها!

ئۆرست: ئەوە دەیەوێ ئێمە لەیەک جیابکاتەوە، دیواری تەنیایی بەدەوری تۆوە بکێشێ. وریابە: وەختایەک تۆ تەواو تەنیا دەبیت، تەواو تەنیا و بێ پشت و پەنا، ئەوان هەڵدەکوتنە سەر تۆ، ئێمە پێکەوە پێکرا بڕیاری ئەم کوشتنەمان دا و دەبێ پێکەوەش بەرگەی پاشهاتەکانی بگرین.

ئێلکتر: تۆ پێت وایە کە من ئەم کوشتنەم ویستووە؟

ئۆرست: ئایا ئەمە ڕاست نییە؟

ئێلکتر: نەخێر، ئەمە ڕاست نییە. بوەستە...... بەڵێ! ئاه! من هیچیتر نازانم. من خەونم بەم کوشتنەوە دەبینی، بەڵام تۆ ئەنجامت دا، خونکاری دایکی خۆت.

ئێرینییەکان پێدەکەنن و هاوار دەکەن: خونکار! خونکار! کوشتکار!

ئۆرست: ئێلکتر، لەم دیو دەرگایەوە جیهان هەیە. جیهان و سپێدە. لە دەرەوە خۆر بەسەر ڕێگەکاندا هەڵدەکشێ. بەم زووانە دەردەچین، دەچینە سەر ڕێگەکانی بەر خۆرەتاو و، ئەم کچانەی شەویش توانای خۆیان لەدەست دەدەن: تاڵە خۆری ڕۆژ وەکو شمشێر لێیانەوە دەردەچێ.

ئێلکتر: خۆر...

ئێرینی یەکەم: ئێلکتر تۆ هەرگیز جارێکی دیکە خۆر نابینیتەوە. وەکو ڕەوەکوللە لەنێوان خۆر و تۆوە پاڵ بەیەک دەدەین و لە هەموو شوێنێکەوە شەو دەخەینە سەر سەرت.

ئێلکتر: لێم گەڕێن! واز لە ئازاردانم بهێنن!

ئۆرست: ئەوە بێهێزی تۆیە کە دەبێتە هێزی ئەوان. چاو: ئەوان جورئەت ناکەن هیچ بەمن بڵێن. گوێبگرە: یەک تۆقینی بێناو خۆی خستۆتە سەر تۆ و لە یەکمان جیا دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا تۆ لەناو ئەم ترسە ژیاوی و من نا؟ ناڵە ناڵەکانی دایکم، باوەڕ دەکەی کە گوێچکەکانم هەرگیز لە گوێبیستنیان بوەستێ؟ و چاوە گەورەکانی –



وەک دوو ئۆقیانووسی سەرشێت – لەناو سیما کلسییەکەیەوە، تۆ پێت وایە چاوەکانم هەرگیز لە سەیرکردنیان بوەستێ؟ ئەو نیگەرانەی تۆ هەڵدەلووشێ، پێت وا نییە بۆ هەمیشە واز لەکرتاندم بهێنێ. بەڵام ئەوەی بەلای منەوە گرینگە ئەوەیە: من ئازادم. لەو دیو نیگەرانی و بیرەوەرییەکان. ئازاد، گونجاو لەگەڵ خۆم. ئێلکتر نابێ ڕقت لەخودی– خۆت ببێتەوە. دەستم بدەرێ: هەرگیز وازت لێ ناهێنم.

ئێرینی یەکەم: تۆ دەبینی! تۆ دەبینی! بووکە چکۆلانەکە ئێمە لەو کەمتر ترس بۆ تۆ ناهێنین؟ ئێلکتر تۆ پێویستت بە ئێمەیە، تۆ منداڵی ئێمەیت. تۆ پێویستت بە نینۆکەکانمان هەیە تا گۆشتت هەڵبکۆڵێ، تۆ پێویستت بەددانەکانی ئێمەیە بۆ گازگرتن لە سینەت. تۆ پێویستت بە خۆشەویستی دڕندانەی ئێمەوە هەیە تا ڕقت لە خۆت ببێتەوە. تۆ پێویستت بە ئازارچەشتنە لەناو جەستەتەوە بۆ لەبیرکردنی ئازارەکانی گیانت. وەرە! وەرە! تۆ تەنها دوو پەیژەت ماوە بۆ دابەزین، ئێمە لەناو باوەشمان پێشوازیت لێ دەکەین، بەماچەکانمانا گۆشتە تازەکەت هەڵدەدڕین و دواتر فەرامۆشی، فەرامۆشی لەناو ئاگرێکی گەورەی پاکی ئازار.

ئێرینییەکان: وەرە! وەرە!

زۆر بەهێواشییەوە وەک بڵێی جادووی لێبکەن سەما دەکەن.

ئێلکتر خۆی هەڵدەستێتەوە.

ئۆرست: بە باوەشییەوە دەیگرێ: مەچۆ، لێت دەپاڕێمەوە، لەناو دەچی.

ئێلکتر، بە توندییەوە خۆی ڕادەپسکێنێ: ها! من ڕقم لێتدەبێتەوە.

(ئێلکتر لە پەیژەکان دەچێتە خوار، ئێرینییەکان هەموویان هەڵدەکوتنە سەری).

ئێلکتر: هۆ فریادڕەس!

ژووپیتێر: دێتە ناوەوە.

## شانۆی دووەم

هەمان کەسەکان، ژووپیتێر

ژووپیتێر: بۆکولانەکانتان دەی!

ئێرینی یەکەم: مامۆستا!

ئێرینییەکان بە تووڕەییەوە خۆیان دوور دەخەنەوە، لێدەگەڕێن ئێلکتر لەسەر زەوی ڕابکشێ.

ژووپیتێر: مندالّە بچکۆلەکان (بەرەو لای ئێلکتر دەچێتە پێش) کەوا بوو ئا ئەوەتا ئەوە بوو ئێوە پێی گەیشتن؟ تووڕەیی و بەزەیی لەناو دلّەکەم بەشەڕدێن. ئێلکتر هەلّسەوە: تاوەکو من لێرەبم، دێلّەسەگەکانم ئازار بەتۆ ناگەیەنن (یارمەتی دەدات لە هەستانەوەی) چ سیمایەکی تۆقێنەرە. یەک تاکە شەو! بەیەک تاکە شەو سیما دەشتەکییەکەت چی بەسەر هات؟ لە تاکە یەک شەودا، گورچیلە، سینە و سیپەلاکت لەکار کەوتن، جەستەت جگە لە چنگێ کلّۆلّی چیتری لێ نەماوەتەوە ئاه!

هۆ گەنجی سەرکێش و سەرشێت چ خراپییەکتان بەخۆتان گەیاندووە!

ئۆرست: ئەم دەنگەت بگۆڕە پیاوی ساویلکە: ئەوە شایستەی پادشاکان نییە.

ژووپیتێر: تۆش ئەم دەنگە شانازیکارە بگۆڕە: ئەم دەنگە لە دەنگی تاوانبارێک ناچێت کە خەریک بێ لە تاوانەکەی خۆی پەشیمان بێتەوە.

ئۆرست: من تاوانبار نیم و تۆش ناتوانی لە تاوانێک پەشیمانم بکەیتەوە کە وەکو تاوان نایناسم.

ژووپیتێر: لەوانەیە تۆ خۆت هەلّبخەلّەتێنی، بەلاّم ئارام بگرە. لێتناگەڕێم ماوەیەکی زۆر لەناو هەلّەدا بمێنییتەوە.



ئۆرست: چەند ئارەزوو دەکەی ئازارم بدە، من لە هیچ پەشیمان نیم.

ژووپیتێر: لەسەر ئەو نامەردیەش نا کە خوشکەکەت نوقمی ناو هەلّەی تۆ بووە؟

ئۆرست: ئەوەش نا.

ژووپیتێر: ئێلکتر، تۆ گوێت لێبوو؟ ئەوەیان ئەو کەسەیە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە خۆشی دەوێی.

ئۆرست: لەخۆم خۆشترم دەوێ. بەلاّم ئازارەکانی لە خۆیەوە دەردەچێ، تەنها خۆی دەتوانێ لێیان دەرباز بێ: ئەو ئازادە.

ژووپیتێر: ئەی تۆ؟ لەوانەیە تۆش ئازاد بی.

ئۆرست: تۆ چاک دەیزانی.

ژووپیتێر: بنۆڕە خۆت، ئافەریدەی ملهوڕ و گەلۆر ڕاستییەکەی تۆ خۆت مەزن نیشان دەدەی، تەواو هەلّتووترکاو لەژێر پێی پاشایێکی بەپشت و پەنا، لەگەلّ ئەم دێلّەسەگە برسییانەی کە گەمارۆت دەدەن. جا ئەگەر تۆ جورئەت دەکەی بلّێی من ئازادم. پێویستە ئازادی بەو زیندانییەش بدەی کە لە قوولاّیی زیندانێکەوە بەزنجیر بەستراوەتەوە و هەروا ئازادی بە کۆیلەی لە خاچدراویش بدەی.

ئۆرست: بۆچی نا؟

ژووپیتێر: وریابە: تۆ خۆت فش دەکەیتەوە چونکە ئەپۆلۆن دەتپارێزێ، بەلاّم ئەپۆلۆن خزمەتکارێکی زۆر گوێڕایەلّی منە. ئەگەر یەک پەنجە هەلّبڕم دەستبەردارت دەبێ.

ئۆرست: ئێ کەوایە، پەنجە هەلّبڕە دەستت بەتەواوی هەلّبڕە.

ژووپیتێر: جا سوودی چیە؟ پێم نەوتی من نەفرەت لە سزادان دەکەم؟ من هاتووم ئێوە ڕزگار بکەم.

ئێلکتر: ئێمە ڕزگار بکەی؟ واز لەم گالّتە بەخۆکردنەت بهێنە، خوداوەندی تۆلّە و مەرگ. کەس ڕێگەی پێنەدراوە- هەتاوەکو

خـوداوەندێکیش- هیـوای هەڵخـەڵەتێن بداتە بەر ئەوانەی ئازار دەچێژن.

ژووپیتێر: چارەگێکی دیکە تۆ دەتوانی لێرە نەبیت.

ئێلکتر: ساغ و سەلامەت.

ژووپیتێر: وادەت پێدەدەم.

ئێلکتر: لەبەرامبەر ئەمەدا چیم بەسەردا دەسەپێنی؟

ژووپیتێر: هیچ لە تۆ داوا ناکەم، منداڵەکەم؟

ئێلکتـر: هیچ؟ بەڕاسـتیـتـە ئەوەی گـوێم لێـبـوو خـوداوەندی سـاڵح و خوداوەندی شایستەی پەرستن.

ژووپیتێر: تەقریبەن هیچ. ئاسانترین شتێک کە تۆ بتوانی بمدەیتێ: کەمێک پەشیمان بوونەوەیە.

ئۆرست: وریابە ئێلکتر: ئەم هیچە وەکو چیایێک دەکەوێتە سەر گیانت.

ژووپیـتـێر بە ئێلکتـر: گوێی لێمەگرە و وەڵامی من بدەوە چاترە: تۆ چۆن ئەوە قـەبووڵ ناکـەی نکوڵی لەم تاوانە بکەیت، ئەوە یەکـێکی دیکەیە کـە کـردوویەتی، هەر ناشـتـوانرێ بـوترێ تۆش هاریـکاریت کردووە.

ئۆرست: ئێلکتر! تۆ نکوڵی لە پانزە ساڵی ڕق و هیوا دەکەیت.

ژووپیـتـێر: کێ باسی حاشا لێکردن دەکات؟ ئێلکتر هەرگیز ئەم گلاوییەی نەویستووە.

ژووپیـتـێـر: وەرە! تۆ دەتوانی مـتـمـانە بەمن بکەیت، ئایا من دڵی ئەوم نەخوێندۆتەوە؟

ئێلکتـر: وا نیـیـە: ئایا تۆ دڵی منت خـوێندۆتەوە کـە من ئەم تاوانەم نەویستووە؟

لەوەتای پانزە ساڵەوە خەون بە کوشتن و تۆڵەوە دەبینم؟

ژووپیـتـێـر: پەح! ئەم خـەونە خـوێناوییـانـەی کـە تۆیان هەژاندووە، چەشنە



پاکـیـیـەکـیـان تێدا بوو: کۆیلایەتی تۆیان ڕووپۆش دەکرد و زامی شکۆی تۆیان سـارێژ دەکـرد. بـەڵام تۆ هەرگـیـز بیـرت لە جـێـبـەجێ کردنیان نەکردۆتەوە، ئایا من هەڵەم؟

ئێلکتـر: ئاه! گـیـانەکـەم، خـۆشـەویسـتـەکـەم، چەند ئارەزوو دەکـەم تۆ هەڵەبیت!

ژووپیتێر: تۆ کچۆڵەیەکی تەواو چکۆلانەی، ئێلکتر. کچانی دیکە ئارەزوو دەکەن ببنە دەوڵەمەندترین کچ یاوەکو جوانترین کچ. هەرچی تۆی مـەفـتـوونە لە سـۆنگەی چارەنووسی تۆقـێنەری ڕەگـەزەکـەتەوە ئارەزووت کردووە ببیتە پڕ ئازارترین و تاوانبارترین کچ. تۆ هەرگیز خراپەت نەویستووە: تۆ تەنها بەدبەختی خۆت ویستووە. لە تەمەنی تۆ، منداڵەکان هێشتا بە بووکۆکە یا بە چوارگۆشەکان وازی دەکەن، کەچی تۆ کچۆڵە چکۆلانەکە، بێ یاری و بێ هاوڕێ، تۆ وازیت بە تاوان کرد، چونکە ئەمە یارییەکە دەتوانین بە تاک و تەنیا بیکەین.

ئێلکتر: مەخابن! مەخابن! گوێت لێدەگرم و خۆم بەڕوونی دەبینم.

ئۆرست: ئێلکتر! ئێلکتر! ئێستە تۆ گوناهباری ئەوەی کە تۆ ویستووتە، کێ دەتوانێ بیزانێ تۆ چیت ویستووە ئەگەر خۆت نەبیت؟ ڕێگە بە یەکـێکی دیکە دەدەیت بڕیاری لێـبـدات؟ بۆچی ڕابوردوویێک دەشێوێنی کە ناتوانێ چیتر بەرگری لەخۆی بکات؟ بۆچی نکوڵی ئەم ئێلکترە سەرکێشە، ئەو خوداوەندە گەنجەی تووڕەیی دەکەیت کە ئەو هێندە خۆشم دەویست؟

تۆ نابینی ئەم خوداوەندە دڵڕەقە وازیت پێدەکات.

ژووپیـتـێر: من وازی بەئێـوە دەکەم؟ گوێ بگرن لەوەی من پێشنیـارتان بۆ دەکـەم: ئەگەر ئێـوە دەستبـەرداری تاوانەکـانتـان بن، هەردووکتـان دەخەمە سەر عەرشی ئارگۆس.

ئۆرست: لە شوێن قوربانییەکانمانەوە.

ژووپیتێر: پێویستە وابێ.

ئۆرست: ئەوجا جلوبەرگەکانی پاشای خوالێخۆشبوو لەبەر دەکەم کە
هێشتاکە هەر نیمچە گەرمن؟

ژووپیتێر: ئەمانەیان هی دیکە، گرینگییەکی نییە.

ئۆرست: بەڵێ، چاکتر وایە ڕەشبن، وانییە.

ژووپیتێر: تۆ لە ماتەمیدا نیت؟

ئۆرست: لە ماتەمی دایکم، من لەبیرم کردبوو. بندەستەکانیشم دەبێ ئەوانیش جلی ڕەش بپۆشن؟

ژووپیتێر: ئەوان پێشتر پۆشیویانە.

ئۆرست: ئەمە ڕاستە، با لێیان بگەڕێین کاتیان بێ جلوبەرگە کۆنەکانیان بسوێ. ئێ ئەوجا؟ تۆ تێگەیشتی ئێلکتر؟ ئەگەر چەند دڵۆپە فرمێسکێک هەڵبڕێژی، ژێر تەنوورە و کراسەکانی کلیتیمنسترت پێدەبەخشن- ئەو کراسە بۆگەن و پیسانەی تۆ پانزە ساڵ بە دەستەکانی خۆتەوە شوشتووتن، هەروا دەوری کلیتیمنستر چاوەڕوانت دەکات، تۆ تەنها ئەوەت بۆ ماوەتەوە کە دەردەکە بگێڕی، خەیاڵکردنەکە تەواو دەبێ، هەموو خەڵک پێیان وایە جارێکی دیکە دایکت دەبیننەوە، چونکە تۆ لەو دەچیت. بەڵام من زۆر قێزەونترم: پانتۆڵەکانی ئەم گاڵتەجارە لەبەر ناکەم کە کوشتم.

ژووپیتێر: تۆ زۆر سەر بەرزدەکەیتەوە: تۆ پیاوێکت کوشت کە بەرگری لە خۆی نەکرد، هەروا پیرەژنێک کە داوای بەخشینی لێ کردی؛ بەڵام ئەوەی گوێت لێبگرێ کە قسە دەکەیت بێ ئەوەی بتناسێ، لەوانەیە باوەڕ بکات کە تۆ زێدی خۆت ڕزگار کردووە و، بەتەنیا دژ بە سی کەسان جەنگاویت.

ئۆرست: لەوانەیە، ڕاستییەکەی من زێدەکەی خۆم ڕزگار کرد.

ژووپیتێر: تۆ؟ دەزانی چی لەم دیو دەرگایەوە هەیە؟ پیاوانی ئارگۆس- هەموو پیاوانی ئارگۆس، بە بەرد، بە پاچ و بە بێڵ چاوەڕوانی ڕزگاریکارەکەیان دەکەن تا منەتباری خۆیانت پێ بدەنەوە. تۆ



تەنیایت وەکو بازەڵەیێک.

ئۆرست: بەڵێ.

ژووپیتێر: بڕۆ خۆت بەوە هەڵمەکێشە هۆ ترسنۆکترینی بکوژەکان، ئەوە لەناو تەنیایی و سووکایەتی و تۆقین دابوو کە تۆیان ڕەتکردەوە.

ئۆرست: ترسنۆکترین بکوژ، ئەوەیە کە پەشیمانی هەیە.

ژووپیتێر: ئۆرست! من تۆم ئەفراند و هەموو شتێکم ئەفراند: بنۆڕە (دیوارەکانی پەرستگەکە شەق دەبەن. ئاسمان وەدیار دەکەوێ ڕازاوە بە ئەستێران کە دەخولێنەوە. (ژووپیتێر لە قوولایی شانۆکەوەیە دەنگی گەورە دەبێ- میکرۆفۆن- بەڵام بە ئاستەم جیا دەکرێتەوە). بنۆڕە ئەم هەسارانە کە بە ڕێکی دەسووڕێنەوە، بێ ئەوەی هەرگیز بەریەک بکەون: ئەوە من بە گوێرەی دادپەروەری ڕێڕەوەکانیانم ڕێکخستووە، گوێ لە هارمۆنی فەلەکەکان بگرە، ئەو گۆرانییە فرەیەی شکۆی بێ گیانی کە لە هەر چوارگۆشەی ئاسمانەوە دەدرەوشێنەوە (میلۆدی). بەهۆی منەوە جۆرەکان بەردەوام دەبن، من فەرمانم داوە مرۆ بنێتەوە و گوجیلە سەگ لە سەگ ببێتەوە، بەهۆی منەوەیە کە زمانی نەرمی هەڵکشان و داکشانی دەریا لمەکان دەلێسێتەوە و لەکاتی دیاریکراودا خۆی دەکێشێتەوە، من گژوگیایان دەڕوێنم، هەناسەی من بە دەوری زەوییەوە ڕێیەری هەورە زەردەکانی تۆزی هەڵاڵە دەکات. تۆ لە ماڵی من نیت، غەوارە تۆ لە جیهاندای وەک تەلزمێک لە ناو گۆشت، وەکو ڕاوچییەکی ڕێگەپێنەدراو لەناو دارستانێکی پادشایی: چونکە جیهان چاکەیە. من بە گوێرەی ویستی خۆم ئەفراندوومە و من خۆم چاکەم. بەڵام تۆ، خراپەت دروست کرد، شتەکانیش بەدەنگە بە بەردبوویەکانیانەوە گوناهبارت دەکەن: چاکە لە هەموو شوێنێکە و کرۆکی ڕووەکی بەلەسانە، سازگاری کانیاوە، دەنکی سیلێکسە، ڕاکێشەری بەردە، تۆ دەبینی

هەتا لە سروشتی ئاگر و ڕووناکیشەوە، خودی جەستەی خۆشت
ریسوات دەکات، چونکە بە گوێرەی ماوە دیاریکراوەکانی من
بەستراونەتەوە. چاکە لەناو تۆدایە، لە دەرەوەی تۆدایە: وەکو داس
بە ناوتدا ڕەتدەبێ. وەکو چیاییێک پانت دەکاتەوە، هەڵتدەگرێ و
وەکو دەریاییێک دەتسووڕێنێتەوە؛ ئەوە ئەوەیە کە ڕێگە بە
سەرکەوتنی کردە خراپەکارییەکانت دەدات، چونکە دەبێتە ڕۆشنایی
مۆمەکان، پتەوی شمشێرەکەت، هێزی باسکت. ئەو خراپەیەی کە
تۆ هێندە شانازی پێوە دەکەی و پێت وایە تۆ دروستت کردووە،
چییە ئەگەر ڕەنگدانەوەیەکی بوون، هەلاتوویێکی شاراوە،
ئیماژێکی هەڵخەڵەتاو نەبێ، کە بوونی خۆی پشت ئەستوورە بە
چاکە. بگەڕێوە ناو خۆت، ئۆرست گەردوون پێت دەڵێ هەڵەیت و
تۆش پێشوولەیەکی لەناو گەردوون. بگەڕێوە بۆ سروشت، هۆ کوڕی
ڕێز پەر: دان بەهەڵەکەتدا بێنە، نەفرەتی لێ بکە، لەناو خۆتدا
هەڵیبکێشە وەکو ددانێکی کلۆر و پیس بوو. ئەگەر نا بترسە دەریا
لە بەرامبەر تۆ خۆی بکێشێتەوە، کانیاوەکان لەسەر ڕێگەت وشک
بێن، بەردەکان و گاشەبەردەکان لەسەر ڕێگەکەتەوە گلۆر ببنەوە و
زەوی لەژێر پێیەکانتدا هەڵبوەشێتەوە.

ئۆرست: جا با زەوی هەڵبوەشێتەوە! گاشەبەردەکان ریسوام بکەن و
گژوگیایەکان لەسەر ڕێگەم هەڵبوەرن: هەموو گەردوونی تۆ بەشی
ئەوە ناکات وام لێبکەن هەڵەبم. تۆ پادشای خوداوەندەکانی
ژووپیتێر، پاشای بەردەکان و ئەستێرەکان، پاشای شەپۆلەکانی
دەریا، بەلاّم تۆ پاشای مرۆڤەکان نیت. دیوارەکان لەیەک نزیک
دەبنەوە، ژووپیتێر بەدیار دەکەوێتەوە، شەکەت و کۆماوە، دەنگی
سروشتی خۆی وەرگرتەوە.

ژووپیتێر: من پاشای تۆنیم، کرمی پیس و چەپەڵ، کە وایە کێ تۆی
دروستکرد؟



ئۆرست: تۆ. بەلاّم دەبوایە ئازادت دروست نەکردبوومایە.

ژووپیتێر: من ئازادیم بە تۆ بەخشی تا خزمەتی من بکەیت.

ئۆرست: لەوانەیە وابێ، بەلاّم ئەوە دژی خۆت وەستایەوە و ئێمە هیچمان
پێناکرێت، نە من و نە تۆ.

ژووپیتێر: دواجار، ئەوەتا مەعزەرەتتهێنایەوە.

ئۆرست: من داوای مەعزەرەتخوازی ناکەم.

ژووپیتێر: بەڕاستییتە؟ تۆ دەزانی ئەمە زۆر لە مەعزەرەتهێنانەوەیەک
دەچێ، ئەو ئازادییەی کە تۆ پێت وایە کۆیلەی؟

ئۆرست: من نە ئاغام نە کۆیلەم، ژووپیتێر. من ئازادی خۆم هەیە! هەر لەو
ساوەی تۆ منت دروستکردووە من هی تۆ نیم.

ئێلکتر: بەسەری باوکمان، ئۆرست سوێندت بۆ دەخۆم کە جنێودان لەگەڵ
تاوان کۆنابنەوە.

ژووپیتێر: گوێی لێبگرە. بێ هیوایە لەوەی بە بیانووەکانی خۆت
بیگێڕیتەوە: ئەم زمانە وا دیار دەکەوێ زۆر نوێیە بۆ گوێچکەکانی
و تاڕادەیەک جاڕسە.

ئۆرست: لە گوێچکەکەی منیش هەروا، ژووپیتێر، بۆ گەرووم کە وشەکان
هەڵدەپەنمێن و بۆ زمانم کە لە کاتی ڕۆیشتنیدا دادەڕژێ: دەبوایە
من لەخۆم بگەم. دوێنێ هێشتاکە تۆ پەردەیەک بوویت بەسەر
چاوەکانمەوە، پارچە مۆمێک بووی لەناو گوێچکەکانم؛ ئەوە دوێنێ
بوو کە من مەعزەرەتهێنانەوەیەکم هەبوو: تۆ عوزرخواهی من بوویت
لە بووندا، چونکە تۆ منت بۆیە هێنایە دونیاوە تا خزمەتی
نەخشەکانت بکەم و جیهانیش پیرەژنێکی نێوانکارە کە بێ لێبڕان
باسی تۆی بۆ دەکردم و دواتر منت بەجێهێشت.

ژووپیتێر: من تۆم بەجێهێشت؟

ئۆرست: دوێنێ، لە نزیک ئێلکتر بووم، هەموو سروشتی تۆ بە دەورەی
منەوە خۆی دەهێنایە پێشەوە، گۆرانی بۆ چاکەی تۆ دەچڕی و

ئامۆژگاری دەکردم. خۆرەتاوی سووتاوە وەک نیگایەکی خۆشاردووەوە ناسکتر دەبوو بۆ ئەوەی بمخاتە ناو فێنکی ئاسمان وەکو لێبووردنێک ئازاری دەچەشت تا وەعزم بۆ بدات، بۆ لە بیرکردنی خراپەکان. گەنجێتیم کە گوێڕایەڵی یاسایەکانت بوو هەڵسایەوە. لەبەر دەم ڕوانینەکەم وێستابوو وەکو دۆستێکی بەجێهێڵراو دەپاڕایەوە: بۆ دوایەمین جار گەنجێتیم دەبینم. بەڵام لە ناکاوێکەوە ئازادی بەسەر مندا توایەوە و ڕاچڵەکیم، سروشت بازی هەڵدایە دواوە و من هیچی دیکە تەمەنم بۆ نەمایەوە، هەستم کرد تەواو تەنیام، لە نێوەراستی جیهانە چکۆڵانە گرفتارەکەی تۆ، وەک کەسێک سێبەری خۆی لێ ون بووبێ!

هیچ شتێک لە ئاسمان نەمایەوە، نە چاکە و نەخراپە، نە هیچ کەسێکیش بۆ ئەوەی فەرمانم بۆ دەربکات.

ژووپیتێر: ئێ ئەوجا؟ تۆ بڵێیی من ستایشی ئەو بزنە بکەم کە لە مێگەڵ گەڕدەبێ، یا ئەو گولیەی کە لە کەرەنتێنەکەی خۆی گیر دەبێ؟ وەبیر خۆت بهێنەوە ئۆرست: تۆ بەشێک بووی لە مێگەلەکەم، تۆ گژوگیای کێڵگەکانت بۆ ناو بزنەکانم دەبرد. ئازادی تۆ تەنها گەڕبوونێکە کە دەتخوا، ئەوە تەنها تاراوگەیەکە.

ئۆرست: تۆ ڕاستت وت: تاراوگەیەکە.

ژووپیتێر: خراپە ئاوەها قوولّ نییە: مێژووەکەی دوێنێیە. بگەڕێوە ناو ئێمە. بگەڕێوە: بنۆڕە تۆ تەنیای، تەنانەت خوشکەکەشت وازی لێهێنای. تۆ ڕەنگ زەردی و نیگەرانی چاوەکانت فراوان دەکەن. ئایا بەهیوای بژی؟ ئا ئەوەتا تۆ بە خراپەیەکی نامرۆڤانەوە، نامۆ بە سروشتی منەوە، نامۆ بە خودی خۆشتەوە، کلۆر بوویت، بگەڕێوە: من لەبیرچوونم، من ئاسوودەگیم.

ئۆرست: بێگانەیە بەخودی خۆشمەوە، دەزانم. لە دەرەوەی سروشت، دژ بە سروشت، بەبێ خوایشت، بە بێ هیچ سەرچاوەیەکی دیکە جگە لە



خۆم. بەڵام من ناگەڕێمەوە ژێر یاسایەکانی تۆ. من مەحکوومم بەوەی هیچ یاسایەکی دیکە قەبووڵ نەکەم جگە لە یاسای خۆم نەبێ. ناگەڕێمەوە بۆ سروشتی تۆ: هەزار ڕێگەی تێدا هەن کە بەرەو تۆ دێنەوە، بەڵام من تەنها دەتوانم بە شوێن ڕیزی خۆم بکەوم. چونکە من ئینسانم، ژووپیتێر. هەموو مرۆڤێک دەبێ ڕێگەی خۆی دابهێنێ. سروشت قێز لە ئینسان دەکاتەوە و تۆش، تۆ، پادشای خواوەندەکان، تۆش هەروا تۆ بێزت لە مرۆ دەبێتەوە.

ژووپیتێر: تۆ درۆ ناکەی: وەختایێک لە تۆ بچن، من ڕقم لێیان دەبێتەوە.

ئۆرست: وریابە: وا تۆ دانت بەلاوازی خۆتدا هێنا. من ڕقم لە تۆ نابێتەوە. چی لە نێوان من و تۆدا هەیە؟ وەکو دوو گەمی یەک لە بەرامبەر ئەوی دیکە دەخلیسکێین بێ ئەوەی بەر یەک بکەوین. تۆ گەورەیی و منیش ئازادم: ئێمە لە تەنیایی و نیگەرانیمان پێکدەچین. کێ بە تۆی گوت کە من بەدرێژایی ئەم شەوە درێژە بە دوای پەشیمانی نەگەڕاوم؟ پەشیمانی. خەو. بەڵام من نامەوێ چیتر نەپەشیمانی، نەخەوم هەبێ.

(بێدەنگییەک)

ژووپیتێر: دەتەوێ چی بکەی؟

ئۆرست: پیاوەکانی ئارگۆس پیاوەکانی منن، دەبێ من چاویان بکەمەوە.

ژووپیتێر: ئەی خەڵکی هەژار! تۆ دیاری تەنیایی و شەرمەزاریان بۆ دەهێنی، تۆ پۆشاکەکانیان لەبەر دەکەیتەوە کە من پێم داپۆشیون و تۆ لە ناکاوێکدا بوونیان، بێشەرمیان و بوونی گڵاویان بۆ دەردەخەی کە من بەبێ هیچ بەرامبەرێک پێم بەخشیون.

ئۆرست: من بۆچی ئەو بێ هیواییەیان لێ ڕەتدەکەمەوە کە لە ناوەوەی منە، چونکە ئەمە بەشی تۆیە؟

ژووپیتێر: چی پێدەکەن؟

ئۆرست: هەرچییەک بیانەوێ: ئەوان ئازادن و ژیانی مرۆڤایەتی لەو دیو

کەناری بێ هیواییەوە دەست پێدەکات.
(بێدەنگییەک)

ژووپیتێر: ئێ ئەوجا، ئۆرست، هەموو ئەمانە پێشبینی کراون. پیاوێک دەبێ بێت ئاوابوونی من جاڕ بدات. کەوایە ئەو پیاوە تۆی؟
کێ باوەڕی دەکرد، ئەگەر دوێنێکە سیما کچانەکەتی ببینیبوایە؟

ئۆرست: تۆ بڵێی منیش خۆم باوەڕ بکەم؟ ئەو وشانەی گوتم زۆر گەورە بوون بۆ دەمم، دەیدڕێنن؛ ئەو چارەنووسەی کە هەڵیدەگرم بۆ گەنجیم زۆر قورسە دەیشکێنێ.

ژووپیتێر: من هیچ تۆم خۆشناوێ و لەگەڵ ئەوەشدا بۆت دەپاڕێمەوە.

ئۆرست: منیش هەروا بۆ تۆ دەپاڕێمەوە.

ژووپیتێر: ماڵئاوا، ئۆرست (چەند هەنگاوێک دەنێ)، هەرچی سەبارەت بە تۆیە ئێلکتر، بیر لەمانە بکەوە: حوکمڕانی من هێشتا کۆتایی نەهاتووە، ئەمە کاتێکی دەوێ و من نامەوێ واز لە ململانێ بهێنم. بنۆڕە ئەگەر تۆ لەگەڵ مندای یا دژی منی، ماڵئاوا.

ئۆرست: ماڵئاوا

(ژووپیتێر: دەڕوات)

**شانۆی سێیەم**

هەمان کەسەکان، جگە لە ژووپیتێر.

(ئێلکتر بەهێواشی هەڵدەستێتەوە)

ئۆرست: بۆ کوێ دەچی؟

ئێلکتر: لێمگەڕێ هیچم نییە پێت بڵێم.

ئۆرست: تۆ کە دوێنێ ناسیمی، دەبێ بۆ هەمیشە ون بیت؟

ئێلکتر: کاشکێ بۆ خوداوەندەکان کە هەرگیز تۆم نەناسیبوایە.

ئۆرست: ئێلکتر! خوشکەکەم، خۆشەویستەکەم ئێلکتر! خۆشەویستە



تاقانەکەم، تاقە ناسکی ژیانم، بە تەنیا جێم مەهێڵە، لەگەڵ مندا بمێنەوە.

ئێلکتر: دز! من بە نزیکی هیچ شتێکم نەبووە جگە لە کەمێک بێدەنگی و مشتێک خەون. تۆ هەموویانت برد، تۆ کچە هەژارێکت دزی، تۆ برام بووی، سەرۆکی خێزانەکەمان بووی، تۆ دەبوایە منت بپاراستبوایە: بەڵام تۆ منت نوقمی ناو خوێن کرد، من سوورم وەکو مانگایەکی کەوڵکراو؛ هەموو مێشە شەڕانگێزەکان بەدوامەوەن و دڵەکەشم شانەیەکی تۆقێنەرە!

ئۆرست: خۆشەویستەکەم، ڕاستە من هەموویم لە تۆ برد و هیچم نییە پێت ببەخشم جگە لە تاوانەکەم نەبێ. بەڵام ئەمە پەیامێکی فرە گەورەیە، تۆ پێت وا نییە وەکو قورقشم دەکەوێتە سەر گیانی من؟
ئێلکتر ئێمە زۆر سووک بووین پێیەکانمان وەکو تایەی عارەبانەیەک لەناو زەندۆڵێک، دەچێتە ناو زەوییەوە. وەرە، دەڕۆین و بەپێی قورسەوە ڕێدەکەین، پشت کۆماو لەژێر باری قورسمان تۆ دەستتم بدەرێ و ئێمە دەگەین...

ئێلکتر: بۆ کوێ؟

ئۆرست: نازانم، بەرەو خودی- خۆمان. لەو دیو کەناری ڕووبارەکان و چیایەکانەوە ئۆرستێک و ئێلکترێک هەن چاوەڕوانمان دەکەن. دەبێ بە حەوسەڵەوە بەدوایاندا بگەڕێین.

ئێلکتر: نامەوێ چیتر گوێت لێبگرم. تۆ تەنها بەدبەختی و قێزەونیم پێشکەش دەکەیت. (بەسەر شانۆکە باز دەدات. ئێرینییەکان بەهێواشی نزیک دەبنەوە). فریادڕەسی! ژووپیتێر پادشای هەموو مرۆڤەکان، پاشایەکەم بمخە ناو باوەشتەوە، هەڵمبگرە، بمپارێزە. من بە شوێن یاسای تۆ دەکەوم، دەبمە کۆیلەی تۆ و دەبمە کەلوپەلی تۆ، پێیەکان و ئەژنۆکانت ماچ دەکەم. بمپارێزە دژ بە مێشەکان، دژ بە براکەم، دژ بە خودی- خۆمەوە، بەتەنیا جێم مەهێڵە، تەواوی ژیان

بۆ پەشیمانبوونەوە تەرخان دەکەم. من پەشیمانم، ژووپیتێر، من پەشیمانم. (بەڕاکردنەوە دەردەچێ)

## شانۆی چوارەم

ئۆرست، ئێرینییەکان

ئێرینییەکان جوولەیەک دەکەن بۆ شوێنکەوتنی ئێلکتر، یەکەم ئێرینی دەیانوەستێنێ.

ئێرینی یەکەم: لێیگەڕێن، خوشکەکانم، لەدەستمان چوو. بەڵام ئەوەیانمان بۆ ماوەتەوە و پێم وایە بۆ ماوەیەکی درێژ، چونکە گیانە چکۆڵەکەی سەختە، بایی دووکەس ئازار دەچێژێ.

ئێرینییەکان دەستدەکەن بە گیزەگیز و خۆیان لە ئۆرست نزیک دەکەنەوە.

ئۆرست: من بە تاق و تەنیام.

ئێرینی یەکەم: بەڵام نا، هۆ ناسکترین بکوژ، من بۆ تۆ ماومەتەوە: تۆ دەبینی بۆ کات بەسەربردن چ یارییەکت بۆ دادەهێنم.

ئۆرست: تا مردن من تەنیا دەبم، دواتر...

ئێرینی یەکەم: ئازایی، خوشکەکانم، بێ هێز بووە. بنۆڕن: چاوەکانی فراوان دەبن: بەم زووانە دەمارەکانی وەکو ژێیەکانی قەیسارەیەک لەسەر لەرەی ناسکی ئازارچەشتن دەزرنگێنەوە.

ئێرینی دووەم: بەم زووانە. برسێتی لەناو نەواکەی ڕاوی دەنێ: پێش ئەم ئێوارەیە تامی خوێنی دەکەین.

ئۆرست: ئێلکتری هەژار!

پەروەردەکار ژوورەوە.



## شانۆی پێنجەم

ئۆرست، ئێرینییەکان، پەروەردەکار

پەروەردەکار: ئەوە ئێوە لەکوێن گەورەم؟ من هیچ نابینم بڕێک خواردنم بۆتان هێناوە: خەڵکانی ئارگۆس پەرستگەکەیان ئابڵوقە داوە، ئێوە ناتوانن بیر لەوەی بکەنەوە کە لێیەوە دەربچن: ئەمشەو، هەوڵدەدەین ڕابکەین.

تا ئەوکاتە، نان بخۆ (ئێرینییەکان ڕێگەی لێدەگرن) ها! ئەوانە کێن لێرەن؟ هێشتا هەر پروپووچییەکان. چ پەشیمانم بۆ وڵاتی ناسکی ئاتیک، کە تێیدا تەنها عەقڵم بوو کە ڕاستبوو.

ئۆرست: هەوڵ مەدە لێم نزیک بکەویتەوە، دەنا ئەم تەواو بە زیندوویی هەڵتدەزڕێنن.

پەروەردەکار: لەسەر خۆ، جوانەکانم. فەرموون ئەم گۆشت و سەوزەیە وەربگرن، ئەگەر بەخششەکانم دەتوانن ئێوە ئارام بکەنەوە.

ئۆرست: تۆ دەڵێی خەڵکی ئارگۆس، لە بەرامبەر پەرستگەکە ئاپۆرەیانە؟

پەروەردەکار: بە هەموو ڕەزامەندییەکەوە، ناتوانم پێتان بڵێم کامیان زۆرتر قەبیحتر و زۆر سەر ڕەقترن بۆ ئازاردانی ئێوە، ئەم کیژۆڵە جوانانەی ئێرە یا بندەستە خۆشەویستەکانت.

ئۆرست: چاکە (ساتێک) ئەم دەرگایە بکەوە.

پەروەردەکار: ئایا ئێوە شێتن؟ ئەوان بە چەکەکانیانەوە لەو دیو دەرگاوەن.

ئۆرست: چیت پێدەڵێم وا بکە.

پەروەردەکار: بۆ ئەم جارە ئێوە ڕێگەم بدەن بە گوێتان نەکەم، پێتان دەڵێم ئەوان بەردبارانت دەکەن.

ئۆرست: من گەورەی تۆم، هۆ پیرە و، داوات لێدەکەم ئەم دەرگایە بکەوە.

(پەروەردەکار دەرگاکە دەترازێنێ).

پەروەردەکار: ئۆی هەوار! ئۆی هەوار!

ئۆرست: بیخە سەر گازی پشت!
(پەروەردەکـار دەرگـاکـە دەکـاتەوە، لەو دیو لایەکی دەرگـەکـە شاردراوەتەوە).
خەڵکەکە بەزەبروزەنگەوە هەڵدەکوتنە سەر هەردوو لای دەرگەکە و بەحەپەساوییەوە لەبەر ئاستانەکە دەوەستن.
(رووناکییەکی بەهێز)

## شانۆی شەشەم

هەمان کەسەکان، خەڵک
(هاوار لەناو خەڵکەوە).
با بمرێ! بەردبارانی بکەن! پارچە پارچەی بکەن! با بمرێ!
(ئۆرست بێ ئەوەی گوێیان لێبگرێ).
خۆرەتاو!
خەڵکەکە: گاور! پیاوکوژ! کوشتکار. پارچە پارچەت دەکەین.
قورقوشمی تواوە دەخەینە سەر برینەکانت.
ژنێک: چاوەکانت هەڵدەکۆڵم.
پیاوێک: جگەرت دەخۆم.
ئۆرست، (ڕەق ڕاوەستاوە): کەوایە ئەوە ئێوەن، بندەستە زۆر بەوەفایەکانی من! من ئۆرستم، ئۆرستی پاشاتان، کوری ئاگامەمنوون و ئەمە ڕۆژی تاج لەسەرنانی منە.
(خەڵکەکە نەڕەنەڕ دەکەن، بۆڵە بۆڵ دەکەن).
چیـتـر هاوار ناکـەن؟ (خـەڵکەکـە بێـدەنگ دەبن). دەزانم: من دەتانترسێنم. ئەوە پانزە ساڵە، ڕۆژا لە دوای ڕۆژ، بکوژێکی دیکە لەبەردەم ئێوە وەستابوو، پەنجەوانەی سووری لەدەست کردبوون تا مـەچەک. پەنجـەوانەی خـوێناوی و، بەڵام ئێـوە لەو نەدەترسـان،



چونکە ئێوە لە چاوەکانیدا ئەوەتان خوێندبۆوە کە ئەو لە ئێوەیە و جـورئەتی ئەو کـارانەی نییـە. تاوانێـک کـە بکوژەکـەی ناتوانێ بەرگەی بگرێ، ئەوە چیتر تاوانی تاقە کەسێک نییە، وا نییە؟ ئەمـە هەروەک قـەزاوقـەدەرێک وابوو. ئێـوە وەکـو پاشـای خـۆتان پێشـوازیتـان لە تـاوانبـار کـرد و، تاوانی کـۆن لەناو دیوارەکـانی شارەوە سەرگـەردان بوو، بەکاوەخۆ نـاڵەناڵی دەکرد وەکو سـەگێک خـاوەنەکـەی خۆی بزرکردبێ. ئێـوە تێم بڕوانن، خـەڵکی ئارگـۆس، ئێـوە تێگـەیشتن کـە تاوانەکەم هی خـۆمە، من لـەبەرامبـەر خـۆرەتاو بانگەوازی بۆ هەڵدەدەم، ئەوە پاکـانەی ژیان و شکۆی منە، ئێـوە ناتوانن نە من سـزا بدەن و نە سکاڵاش بکەن، ئەوە بۆیە کـە ئێـوە دەترسێن. لەگـەڵ ئەوەشدا هۆ مرۆکانم، خۆشم دەوێن، ئەوە بۆ ئێوە بوو کە من کوشتم. بۆ ئێوە بوو کوشتم.
من هاتـووم داوای شـانشـینییـەکـەم بکەم و ئێـوە ڕێگەتان لێگرتم، چونکە من لە ئێوە نەبووم. بەڵام ئێـسـتـە، من یەکێکم لە ئێوە، هۆ بندەسـتەکانم، ئێمـە بەخوێنەوە پێکەوە بەسـتراوین و من شایسـتەی ئەوەم ببـمـە پاشـای ئێوە. هەڵە و پەشـیـمـانییـەکـانتـان، نیـگەرانی شەوانتان، تاوانی ئێگست، هەمووی هی منە، من هەمووی دەخەمە ئەسـتـۆی خـۆمـەوە. چیـتـر لە مـردووەکـانتـان مـەترسن، ئەوانە مـردووەکـانی منن. ئەوجـا بنۆڕن: مـێشـە بەوەفـایەکـانتـان ئێـوەیان جێـهـێـشت بۆ لای من. بەڵام مـەترسن، خـەڵکی ئارگـۆس: تەواو بەخوێنەوە ناچمە سەرتـەختی عـەرشی قوربانییەکەم: خوداوەندێک پێی بەخشـیم و گـوتم نا. دەمـەوێ ببـمـە پاشایەک بێ زەوی و بێ ڕەعیەت. ماڵئاوا، مرۆیەکانم، هەوڵبدەن بژین:
لێرە هەمـوو شتێک نوێیە، هەموو شتێک دەبێ لە نووژەنەوە دەست پێبکات. ژیانێکی نامۆ، گوێبگرن لەمە: هاوینێکیـان سیـرۆس بە مـشـکان ئاخنرابوو؛ بەڵایەکی تۆقـێنەر بوو، هەمـوو شـتـێکی

دەکرۆژت، هەتا خەڵکی شارەکە تێگەیشتن کە دەیانکرۆژێ. بەڵام ڕۆژێکیان شمشاڵژەنێک هات و لە ناوەڕاستی شارەوە وەستا بەم شێوەیە (خۆی ڕادەوەستێنێ) دەستی پێکرد بەشمشاڵ ژەنین و هەمـوو مشکەکان ئاپۆرەیان دا. پاشان دەستی کرد هەنگاوی گەورەی هەڵنا، ئاوەها (لە بنکەی پەیکەرەکەوە دێتە خوارەوە)، هاواری بۆ خەڵکی سیرۆس کرد: «خۆتان لادەن!» (خەڵکەکە ڕێگەیان دا) و، هەمـوو مشکەکان بەدوودڵییەوە سەریان بەرزکردەوە- هەروەک چۆن مێشەکان دەیکەن! بنۆڕن! بنۆڕنە مێشەکان! و، ئینجا لە ناکاوێکدا تاویان هەڵدایە سەر شوێن پێیەکانی. شمشاڵژەنەکە لەگەڵ مشکەکان بۆ هەمیشە ونبوون. بەم شێوەیە. دەڕوات، ئێرینییەکان بە قیژاندنەوە بە شوێنییەوە تاو دەدەن.

(پەردە)

وەرگێڕان - پاریس

٢٠٠٢/٢/٧ -٢٠٠٠/٢/٥